پڕۆژەی بەهای فەرموودە

قۆناغی
٤

# ٥٠ فەرموودەی پێغەمبەر

صلى الله عليه وسلم



نووسینی
سیروان کاکە أحمد

1438هـ ـ 2017ز
بەهای فەرموودە

# 50
# فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ


ئـــامادەکردنی: سیروان کاکە أحمد

چاپی دووەم ١٤٤١ ز - ٢٠٢٠ ك

١٤* ٢١ سـم ، ١٢٥ لاپەڕە

بابـەت : ئایینی

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان
ژمارە سپاردنی ( ٨٩٧ ) ی ساڵی ٢٠١٨ پێدراوە





**خـەتی بەرگ :** نـــەوزاد کۆیـــی

**دیزاینی ناوەوە و بەرگ:** زەردەشت کاوانی

پرۆژەی بەهای فەرموودە

قۆناغی
٤

# 50

# فەرموودەی پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم

**بۆ منداڵان و نەوجەوانان**

سیروان کاکە أحمد

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْزَلَ الْفُرْقَانَ، وَنَزَّلَ الْقُرْآنَ، وَأَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْإِيمَانِ، وَأَتَمَّ لَنَا بِالْإِحْسَانِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ الْأَتَـمَّانِ الْأَكْمَلَانِ عَلَى سَيِّدِ الْخَلْقِ، وَسَنَدِ الْحَقِّ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ مِنْ بَنِي عَدْنَانَ، وَعَلَى آلِهِ الْكِرَامِ، وَأَصْحَابِهِ الْفِخَامِ فِي كُلِّ زَمَانٍ وَمَكَانٍ، أَمَّا بَعْدُ:

بەڕێزان!

دوای ئەوەی سەرنجماندا، کۆمەڵە کتێبێکی زۆر بۆ منداڵان و نەوجەوانان نووسراون، بە زۆربەی زمانەکانی دونیا، لە بوارەکانی: وەرزش، چیرۆك و کورتە چیرۆك و پەخشان و بەسەرهات بە گشت جۆرەکانیەوە، هەروەها دەربارەی ئاژەڵان و باڵندەکان و جۆرەکانی خواردن و خواردنەوە، وە دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی پەروەردەیی، کە لێرەشدا هەر لایەنەو خاوەن فیکرەیەك، بە جۆرێك کە خۆی پێی ڕاستە باسی پەروەردە دەکات، وە کۆمەڵێك کتێبی تایبەت بە منداڵان و نەوجەوانان دەربارەی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی بەکارهێنان و سوود لێ بینینیان، هەروەها بە جۆرەها شێوازی دیکە، لە دروستکردنی کورتە ڤیدیۆی زانستی و پەروەردەیی، وەك: بەسەرهاتی پێغەمبەران و هاوشێوەکانی، بە باش و خراپەوە...

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْزَلَ الْفُرْقَانَ، وَنَزَّلَ الْقُرْآنَ، وَأَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْإِيمَانِ، وَأَتَمَّ لَنَا بِالْإِحْسَانِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ الْأَتَـمَّانِ الْأَكْمَلَانِ عَلَى سَيِّدِ الْخَلْقِ، وَسَنَدِ الْحَقِّ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ مِنْ بَنِي عَدْنَانَ، وَعَلَى آلِهِ الْكِرَامِ، وَأَصْحَابِهِ الْفِخَامِ فِي كُلِّ زَمَانٍ وَمَكَانٍ، أَمَّا بَعْدُ:

بەڕێزان!

دوای ئەوەی سەرنجماندا، کۆمەڵە کتێبێکی زۆر بۆ منداڵان و نەوجەوانان نووسراون، بە زۆربەی زمانەکانی دونیا، لە بوارەکانی: وەرزش، چیرۆك و کورتە چیرۆك و پەخشان و بەسەرهات بە گشت جۆرەکانیەوە، هەروەها دەربارەی ئاژەڵان و باڵندەکان و جۆرەکانی خواردن و خواردنەوە، وە دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی پەروەردەیی، کە لێرەشدا هەر لایەنەو خاوەن فیکرەیەك، بە جۆرێك کە خۆی پێی ڕاستە باسی پەروەردە دەکات، وە کۆمەڵێك کتێبی تایبەت بە منداڵان و نەوجەوانان دەربارەی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی بەکارهێنان و سوود لێ بینینیان، هەروەها بە جۆرەها شێوازی دیکە، لە دروستکردنی کورتە ڤیدیۆی زانستی و پەروەردەیی، وەك: بەسەرهاتی پێغەمبەران و هاوشێوەکانی، بە باش و خراپەوە...

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْزَلَ الْفُرْقَانَ، وَنَزَّلَ الْقُرْآنَ، وَأَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْإِيمَانِ، وَأَتَمَّ لَنَا بِالْإِحْسَانِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ الْأَتَـمَّانِ الْأَكْمَلَانِ عَلَى سَيِّدِ الْخَلْقِ، وَسَنَدِ الْحَقِّ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ مِنْ بَنِي عَدْنَانَ، وَعَلَى آلِهِ الْكِرَامِ، وَأَصْحَابِهِ الْفِخَامِ فِي كُلِّ زَمَانٍ وَمَكَانٍ، أَمَّا بَعْدُ:

بەڕێزان!

دوای ئەوەی سەرنجماندا، کۆمەڵە کتێبێکی زۆر بۆ منداڵان و نەوجەوانان نووسراون، بە زۆربەی زمانەکانی دونیا، لە بوارەکانی: وەرزش، چیرۆك و کورتە چیرۆك و پەخشان و بەسەرهات بە گشت جۆرەکانیەوە، هەروەها دەربارەی ئاژەڵان و باڵندەکان و جۆرەکانی خواردن و خواردنەوە، وە دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی پەروەردەیی، کە لێرەشدا هەر لایەنەو خاوەن فیکرەیەك، بە جۆرێك کە خۆی پێی ڕاستە باسی پەروەردە دەکات، وە کۆمەڵێك کتێبی تایبەت بە منداڵان و نەوجەوانان دەربارەی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی بەکارهێنان و سوود لێ بینینیان، هەروەها بە جۆرەها شێوازی دیکە، لە دروستکردنی کورتە ڤیدیۆی زانستی و پەروەردەیی، وەك: بەسەرهاتی پێغەمبەران و هاوشێوەکانی، بە باش و خراپەوە...

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْزَلَ الْفُرْقَانَ، وَنَزَّلَ الْقُرْآنَ، وَأَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْإِيمَانِ، وَأَتَمَّ لَنَا بِالْإِحْسَانِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ الْأَتَـمَّانِ الْأَكْمَلَانِ عَلَى سَيِّدِ الْخَلْقِ، وَسَنَدِ الْحَقِّ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ مِنْ بَنِي عَدْنَانَ، وَعَلَى آلِهِ الْكِرَامِ، وَأَصْحَابِهِ الْفِخَامِ فِي كُلِّ زَمَانٍ وَمَكَانٍ، أَمَّا بَعْدُ:

بەڕێزان!

دوای ئەوەی سەرنجماندا، کۆمەڵە کتێبێکی زۆر بۆ منداڵان و نەوجەوانان نووسراون، بە زۆربەی زمانەکانی دونیا، لە بوارەکانی: وەرزش، چیرۆك و کورتە چیرۆك و پەخشان و بەسەرهات بە گشت جۆرەکانیەوە، هەروەها دەربارەی ئاژەڵان و باڵندەکان و جۆرەکانی خواردن و خواردنەوە، وە دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی پەروەردەیی، کە لێرەشدا هەر لایەنەو خاوەن فیکرەیەك، بە جۆرێك کە خۆی پێی ڕاستە باسی پەروەردە دەکات، وە کۆمەڵێك کتێبی تایبەت بە منداڵان و نەوجەوانان دەربارەی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی بەکارهێنان و سوود لێ بینینیان، هەروەها بە جۆرەها شێوازی دیکە، لە دروستکردنی کورتە ڤیدیۆی زانستی و پەروەردەیی، وەك: بەسەرهاتی پێغەمبەران و هاوشێوەکانی، بە باش و خراپەوە...

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِي أَنْزَلَ الْفُرْقَانَ، وَنَزَّلَ الْقُرْآنَ، وَأَنْعَمَ عَلَيْنَا بِالْإِيمَانِ، وَأَتَمَّ لَنَا بِالْإِحْسَانِ، وَالصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ الْأَتَـمَّانِ الْأَكْمَلَانِ عَلَى سَيِّدِ الْخَلْقِ، وَسَنَدِ الْحَقِّ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللهِ مِنْ بَنِي عَدْنَانَ، وَعَلَى آلِهِ الْكِرَامِ، وَأَصْحَابِهِ الْفِخَامِ فِي كُلِّ زَمَانٍ وَمَكَانٍ، أَمَّا بَعْدُ:

بەڕێزان!

دوای ئەوەی سەرنجماندا، کۆمەڵە کتێبێکی زۆر بۆ منداڵان و نەوجەوانان نووسراون، بە زۆربەی زمانەکانی دونیا، لە بوارەکانی: وەرزش، چیرۆك و کورتە چیرۆك و پەخشان و بەسەرهات بە گشت جۆرەکانیەوە، هەروەها دەربارەی ئاژەڵان و باڵندەکان و جۆرەکانی خواردن و خواردنەوە، وە دەربارەی کۆمەڵێك بابەتی پەروەردەیی، کە لێرەشدا هەر لایەنەو خاوەن فیکرەیەك، بە جۆرێك کە خۆی پێی ڕاستە باسی پەروەردە دەکات، وە کۆمەڵێك کتێبی تایبەت بە منداڵان و نەوجەوانان دەربارەی بابەتە ئەلیکترۆنییەکان و شێوازی بەکارهێنان و سوود لێ بینینیان، هەروەها بە جۆرەها شێوازی دیکە، لە دروستکردنی کورتە ڤیدیۆی زانستی و پەروەردەیی، وەك: بەسەرهاتی پێغەمبەران و هاوشێوەکانی، بە باش و خراپەوە...

ئێمە لە ستافی (بەهای فەرموودە)، بە ئەرکی سەرشانی خۆمان دانا، کە هەڵسین بە زیندوو کردنەوەی هەندێ سوننەتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە نێو دڵ و ناخی نەوەو ڕۆڵە شرینەکانی گەلی کوردزمان..

هەڵساین بەئامادەکردنی نامیلکەیەکی خنجیلانە، کە سەرەتا کۆمەڵێك بابەتی هەستیاری تێدا بنووسرێ، دەربارەی شێوازی بیرکردنەوەو مامەڵەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بەرانبەر بەمنداڵان و نەوجەوانان، تا حەقیقەتی ئەم پێغەمبەرە گەورە (صلی الله علیه وسلم)، لە شێوازی مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەو ئاستە بناسن و بزانن.

ئنجا لێرەوە خۆشەویستی ئەم زاتە موبارەکە بخەینە ناخ و دڵیانەوەو، ببنە یەکێك لە قوتابیە بەرجەستەو گیانفیداو خزمەتکارەکانی ئەم ئیسلامە، لە سۆنگەی ئەم بیرکردنەوەمان، ئەم هەنگاوانە نراون، لە ئامادەکردنی نامیلکەکە:

١)- پەنجا فەرموودەی شیرین و ناوازەو پەروەردەییمان دیاری کردوون.
٢)- بۆ هەر فەرموودەیەك، ناونیشانێکی تایبەتمان داناون.
٣)- فەرموودەکانمان سەرەتا واتا کردوون.
٤)- سوودە وەدەستهاتووەکانی فەرموودەکانمان دەرهێناون.
٥)- لە هەندێك بابەت وێنەی تایبەتمان لەگەڵ داناون.

داواکارین لە خوای تعالی بیکاتە توێشووی دوارۆژ بۆ ستافی پرۆژەو هاوکاران، وە توێشوویەکی نەبڕاوە بۆ دایك و باوکی منداڵان و نەوجەوانانیش، کە هەوڵبدەن ڕۆڵە و جگەرگۆشەکانیان بەشدار بکەن

و هانیان بدەن فەرموودەكان لەبەر بكەن و بە پێی بۆ گونجانیش فەرموودەكانیان بۆ شی بكەنەوەو تا بەرچاویان ڕوونتر بێت، لە كاتی جێبەجێ كردن.

لە كۆتاییدا: هەر كەسێك هەوڵی خۆ فێر كردنی ئاین بدات، ئەمە نیشانەیەكە بۆ ئەوە كە خواو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) خۆشیان دەوێ، وە هەر كەسێكیان خۆشویست دەچێتە بەهەشتەوە.

ئنجا بزانە! پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه وسلم) دووعای زۆر كردوە بۆ كەسێك كە خەریكی فێر بوونی فەرموودەكانیەتی و بڵاویان دەكاتەوە، بۆ نموونە فەرموویەتی:

(نَضَّرَ اللهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثاً فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَه غَيْرَهُ)[1].

واتە: خوا ڕووخساری ئەم كەسە جوان و درەوشاوە بكات، كە فەرموودەیەك لە ئێمە دەبیستێ و لەبەری دەكات، وە دەیگەیەنێ بە كەسانی دیكەش.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ أَحْمَد، وَصَحَّحَهُ شعيب الأرنؤوط.

# کاتێك سەرنجی پێغەمبەر ﷺ دەدەی!

خوای پەروەردگار بە حیکمەت و بەخششی خۆی، لە نێو هەموو مرۆڤایەتی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)ی هەڵبژاردو، کردیە پێغەمبەرو پەیامدار، وە جیای کردەوەو تایبەتی کرد بە شێوەیەك، کە هیچ یەکێك لە مرۆڤەکانی تری سەر زەوی، بەم شێوە تایبەت نەکردوە، تا ئاستێك وای لێبکات ببێتە پێشەواو سەرمەشق و مامۆستا بۆ هەموو مرۆڤایەتی، وەك فەرموویەتی:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) لە چرکە چرکەی سەرەتای ژیانیدا تا کۆتایی و وەفات فەرموونی بۆ لای خوای تعالی، ڕازێنراوە بوو بە جوانترین و باشترین ڕەوشتە خەلقی و خولوقیەکان، وە زۆر دوور بوو لە هەموو سیفەتە ناپەسند و ناشرینەکان:

**پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە هەمووو کەس:**

زاناترو، زمان پاراوترو، لە خواترسترو، ئامانەت پارێزترو دەستپاکترو، ڕووخۆشترو، ڕاستگۆترو، عاقڵ و ڕەوشت بەرزترو، نەرم و نیانترو و هێدیی و مەندترو، خاوەن شەرم و شکۆترو، بە سۆزو ڕەحم و دڵسۆزترو، بەڕێزترو پایەدارترو خۆشەویستترو، دادگەرتر بوو، هەروەها زۆر سەلامەت بوو، وە پارێزراوترین کەس بوو لە هەموو سیفەتە خراپ و زەم کراوەکان.

لەسەر ئەو قسانەش کردمان، دۆست و دوژمنی بە ویژدان شایەدیی بۆ دەدەن، بۆیە، ئەگەر تەماشای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بکەین، وەك پەیامبەرو پێغەمبەر، لە هەموو پێغەمبەران پایەدارتر بوو.

ئەگەر تەماشای بکەین وەك مامۆستایەك، باشترین مامۆستاو پێشەنگ بووە بۆ مرۆڤایەتی، وە زمان پاراوترین مامۆستا بووە لە گەیاندنی پەیامەکەی.

ئەگەر وەك هاوسەر بۆ خێزانەکانی تەماشای بکەین، باشترین پیاو بووە.

ئەگەر وەك باوك لێی بڕوانی باشترین باوك بووە، بۆ منداڵەکانی، بێ وێنە بووە.

ئەگەر وەك تێکۆشەرێك لێی بڕوانین، ئازاترین و تێکۆشەرترینی پیاوان بووە.

ئەگەر سەرنجی مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانی بدەین لەگەڵ منداڵان و گەنجان، باشترین باوك بووە بۆ منداڵەکانی، باشترین مامۆستاو پەروەردکار بووە بۆ قوتابیەکانی، وە ڕووخۆشترین و خۆش مامەڵەترین کەس بووە لەگەڵ خەڵك بە گشتی و، منداڵان بە تایبەتی.

# پێغەمبەر گیان ﷺ منداڵانی زۆر خۆشدەویست

**(منداڵێك دڵتەنگ بووایە، دڵی دەدایەوە)**

ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)[1]، کە بچووك بوو، دایکی هێنای بۆ لای پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم)، گوتی: با لە ماڵی تۆ بێت، وە هاوکاریت بکات بۆ ئیش و کار، دە ساڵان لە خزمەت پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، زۆر فەرموودەی گێڕاوەتەوە، جا لە یەکێکیان دەڵێ:

ڕۆژێك پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه وسلم) هاتە ماڵمان، ئەو کاتە من برایەکی بچووکم هەبوو، پێیان دەگوت: (ئەبا عومەیر)، ئەو برایەم چۆلەکەیەکی هەبوو یاری و گەمەی لەگەڵ دەکرد، ڕۆژێك چۆلەکەکە مرد، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەمەی زانی، هات و بینی ئەو منداڵە بێ تاقەت و دڵتەنگە، فەرمووی: ئەوە چی بووە؟ گوتیان: چۆلەکەکەی مردوە، پێی فەرموو: ئەی ئەبا عومەیر، چی لێهات نوغەیر؟! وەك دڵدانەوەو بەسەر کردنەوەی ئەم منداڵە، دەستی کرد بە قسە لەگەڵ کردنی. تەماشا بکەن! لەگەڵ سەرگەرمی و سەرقاڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)،

---

(١) صَحِيح: رَوَاهُ البُخَارِي.

بەگشت کایەکانی دین و دونیا وەك: جەنگ و تێکۆشان و بانگەوازو پەرستشەکان و ئیش و کاری خەڵك، کات دەدات بە منداڵان و قسەی خۆش لەگەڵ کردنیان و دڵدانەومیان لە کاتی ناخۆشی،

وە هەوڵی دڵخۆش کردنیان دەدات، لە کاتێکدا سەرۆکی دەوڵەتێکی گەورەیەو، لە بەرزترین پێگەو پایەی دونیایی و دوارۆژیی دایە.

**مافی ئازادی ڕادەربڕینی بە منداڵ دەدا**

سەهلی کوڕی سەعد (خوا لێی ڕازی بێ)[1]، یەکێکە لە هاوەڵە بەڕێزەکان، دەڵێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) لە مەجلسێك دانیشتبوو، خواردنەومیان بۆ هێنا، کە خواردیەوە بینی لە لای دەستە ڕاستی مێرمنداڵێك هەبوو، لەلای دەستی چەپیشی کۆمەڵێك پیاوی بە تەمەن هەبوون، پێغەمبەر گیان (صلى الله عليه وسلم) بە مێرمنداڵەکەی فەرمووو: ئایا مۆڵەت دەدەی ئەم خواردنەومیە بدەم بەو پیاوە بە تەمەنانە، مێرمنداڵەکە گوتی: ناوەڵڵا ئەی پێغەمبەر خوا (صلى الله عليه وسلم)، حەز ناکەم بەشی خۆم بدەم بە کەس، هیچ کەس بە پێش خۆم بدەم (واتە: لە نۆرەی خۆم دەخۆمەوە).

دڵنیام ئەم منداڵە کە دوو ڕیوایەت هەیە لەسەر ناوەکەیان (عەبدوڵڵا یان فەزڵ) بوون، هەردووکیان کوڕی عەبباسن، کە مامی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، مەبەستیان لەم ڕەفتارە ئەوە بوو، لێویان بەم شوێنەی ئەم قاپ و جامە بکەوێ، کە پێغەمبەری خوا (صلى

---

(١) صَحِيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، وَمُسْلِمٌ.

الله علیه وسلم) لێوی مویارەکی پێوە لکاوەو ناوی پێخواردۆتەوە، ئەگەرنا هێندە ئەدەب فێر بوو بوون، قسەی خۆشەویست ڕەت نەکەنەوە.

ئا لێرەدا ئاماژەیەکی زۆر ڕوون هەیە، کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆر گرنگی تایبەتی بە منداڵ داوە، مافی خۆی پێبەخشیوە، نرخ و بەهای منداڵیەتی پێداوە، فێری ئازایەتی کردوەو، تا ڕاددەیەك مافی هەبێ بۆچوونی خۆی دەربڕێ، وە ڕایهێناون و ئامادەی کردوون، بۆ ئەوەی مافی خۆیان بزانن و داوای بکەن.

**لە نوێژیشدا منداڵی لە باوەش دەکرد**

ئەبو قەتادە (خوا لێی ڕازی بێ)[1]، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك نوێژی دەکرد بۆ هاوەڵان، ئومامەی کچی زەینەبیشی لە باوەش بوو (واتە: کچی کچی بوو)، دەڵێ: کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەچوو سوجدەو کڕنووشی دەبرد، لە باوەشی دەیهێنا خوارو دایدەنا لەسەر زەوی، کە بەرز دەبووەو هەڵدەستایەوە، دووبارە کچەکەی لە باوەشی خۆی دەکردو بڵندی دەکردەوە.

**کە منداڵ لە دایك دەبوو، دوعای بۆ دەکرد**

کاتێك یەکێك لە هاوەڵان خێزانەکەی منداڵی هێنابا دونیاو منداڵیکی خنجیلانەی ببوایە، دەیانهێنا بۆ لای پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه

---

(١) صحیح: رواه البخاري، ومسلم.

وسلم) ئەویش دەیگرتە باوەشی خۆی و دەیگوشی و، ماچی دەکرد، خورما، یان شیرینی لە دەمی منداڵەکە وەردەداو دوعای پیرۆز بەرەکەت و چاك بوونی بۆ دەکرد[١]:

ئەبو موسا (خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: (خێزانەکەم) منداڵێکی بوو، منیش هێنام بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ناوی لێنا ئیبراهیم، ئنجا مەلاشوی هەڵدایەوە بە خورمایەك (دەمی شیرین کرد)، وە دوعای پیرۆز بەرەکەت و چاك بوونی بۆ کرد، پاشان دایەوە دەستی خۆم.

**کە نوێژی دەکرد منداڵ دەچوونە سەر پشتی موبارەکی**

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) نوێژێکی بۆ هاوەڵان دەکرد، نوێژەکە نوێژی فەرز بوو، حەسەن، یان حوسەین یەکێکیان لە کاتی سوجدەو کڕنووش بردن هاتنە نێو مزگەوت، چووە سەر پشتی موبارەکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەریش لەبەر خۆشەویستی و ڕاگرتنی دڵی ئەو منداڵە، خۆی دەهێڵێتەوە لە سوجدەکەی، ئیتر عەبدوڵڵای کوڕی شەداد کە فەرموودەکەیە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: منیش سەرم بەرز کردەوە، بۆ ئەوەی بزانم پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هیچ شتێکی بەسەر نەهاتوە؟! کەچی دەبینم وا منداڵێك لەسەر پشتی موبارەکیەتی، منیش سەرم بردەوە بۆ سوجدەکەم، تا لە نوێژەکە تەواو بوو، خەڵکەکە گوتیان: سوجدەکەت

---

(١) صحيح: رواه البخاري، ومسلم.

درێژ بوو، گومانمان وا بوو وەحیت بۆ هاتبێ، یان شتێك ڕوویدابێ؟ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: نا هیچیان نەبوو، بەڵکو کوڕەکەم لەسەر پشتم بوو، پێم خۆش نەبوو، لەسەر پشتم لایبدەم، تا ئیشی خۆی تەواو کرد (دیارە جۆرە یاریەکی کردوە).

**منداڵانی ماچ دەکرد**

ئەبو هورەیرە (خوا لێی ڕازی بێ)[1]، دەڵێ: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) حەسەنی کوڕی عەلی ماچ کردو، لەو کاتەدا ئەقرەعی کوڕی حابیسی تەمیمی لەلای دانیشتبوو، ئەقرەع گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! (ئایا تۆ منداڵ ماچ دەکەی)؟! لە ڕاستیدا من دە منداڵم هەیە، تا ئێستا یەك منداڵیشم ماچ نەکردوون، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) تەماشای کرد! پاشان فەرمووی: هەر کەس بەزەیی نەنوێنێ، بەزەیی لەگەڵ نانوێنرێ، (واتە: ئەگەر لەگەڵ منداڵ بە بەزەیی نەبی، خوا بە بەزەیی نابێ لەگەڵت).

**لەبەر منداڵی خۆی هەڵساوەتەوە**

عائیشە دایکی ئیمانداران (خوا لێی ڕازی بێ)[2]، دەڵێ: هیچ کەسێکم نەبینیوە لە شێوەی قسە و باس و ئەوەندەی فاطیمة لە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چووبێ، کاتێ (فاطیمة) خوا لێی ڕازی بێ، بهاتبایە بۆ لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)

---

(١) صحيح: رواه البخاري، ومسلم.

(٢) صحيح: رواه البخاري في الأدب المفرد .

لەبەری هەڵدەستاوەو پێشوازی لیَ دەکردو ماچی دەکرد، وە هەروەها لە جێگاکەی خۆی دایدەنیشاند، ئەویش کاتێ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بهاتایە بۆ لای لەبەری هەڵدەستاو پێشوازی لیَ دەکردو ماچی دەکردو لە جێگاکەی خۆی دایدەنیشاند، لە نەخۆشی سەرمەرگیدا هاتە ژوورەوە بۆ خزمەتی، پێشوازی لێکردو ماچی کرد.

**سڵاوی لە منداڵان دەکرد**

ئەنەسی کوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ)[1]، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه وسلم) ڕۆژێك هات بۆ لامان، ئێمە ئەوکاتە منداڵ بووین، سڵاوی لێکردین، منی نارد بۆ پێویستیەك، لەسەر ڕێگاکە دانیشت چاوەڕوانی منی دەکرد هەتا گەڕامەوە، دەڵێ: کەمێك دواکەوتم لە گەڕانەوەم بۆ لای دایکی سولەیم، گوتی: ئەنەس بۆچی دواکەوتی؟ گوتم: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) ناردمی بۆ پێویستیەك، گوتی: چی بوو؟ گوتم: ئەوە نهێنیە، گوتی: نهێنی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بپارێزە. هەروەها ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)[2]، دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) هاتە مەدینە منیان بردە خزمەتی، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئەنەس منداڵێکی زیرەك و وریایە، با خزمەتی تۆ بکات، منیش ماوەی دە ساڵان خزمەتی پێغەمبەرم (صلی الله علیه وسلم) کرد، کاتێ لە سەفەر بوو لەگەڵی بووم، کاتێ لە ماڵ

---

(١) صحيح: رواه مسلم.

(٢) صحيح: رواه البخاري، ومسلم.

بوو لەگەڵی بووم، هەمیشە لەگەڵی بووم، لەو ماوەیە زۆرەدا هەرگیز پێی نەگوتم: ئۆف! وە بۆ هیچ شتێك كە نەمكردبێ پێی نەفەرمووم: بۆ ئەنجامت نەداوە، وە بۆ هیچ شتێك كە كردبێتم نەیفەرمووە: بۆ ئەوەت ئەنجام داوە؟

**زۆر دڵسۆز بووە بۆ كچە بچووكەكان**

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زۆر بە سۆز بوو بۆ منداڵان بە گشتی، بە تایبەتی بۆ كچی بچووك، لەوبارەوە ئیبنو عەبباس (خوا لە خۆی و باوكی ڕازی بێ)، دەڵێ[1]: پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: هیچ مسوڵمانێك نیە كە دوو كچی هەبن، بە چاكی هاوڕێیەتیان لەگەڵدا بكات، بێگومان دەیخەنە بەهەشتەوە.

**یاری لەگەڵ منداڵان دەكرد، دەیخستنە سەر شانی خۆی**

بەڕائی كوڕی عازیب و ئەبو هورەیرە (خوا لێیان ڕازی بێ)[2]، دەگێڕنەوە، دەڵێن: پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) بینی حەسەن و حوسەینی، هەر یەكە لەسەر شانێكی خۆی دانابوو، صەڵاتی خوای لەسەر بێ، جارێك حەسەنی ماچ دەكردو، جارێك حوسەینی ماچ دەكرد، تا گەیشتە لای ئێمە، پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەو منداڵانەت خۆش دەوێن؟ (پێغەمبەری خواش صلی الله

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِي في الأدب المفرد.

(٢) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِي.

علیه وسلم) فەرمووی: بەڵێ، هەر کەسێکیش حەسەن و حوسەینی خۆشبوێ، ئەوە منی خۆشویستوە، هەر کەسێکیش ڕقی لێیان بێتەوە، ئەوە ڕقی لە من دەبێتەوە (ڕەنگە مەبەست ئەوەش بێ، هەر کەسێك منداڵی خۆشبوێ، ئەوە منی خۆشویستوە، هەر کەس ڕقی لە منداڵ بێ، ئەوە منی خۆشنەویستوە، وەك هاندانێك تا خەڵك منداڵانیان خۆش بوێ).

**داوای لە دایك و باوك دەکرد دادگەربن لەگەڵ منداڵ**

عامیری کوڕی نوعمانی کوڕی بەشیر (خوا لە خۆی و باوکی ڕازی بێ)[1]، باوکی بۆی گێڕاوەتەوە، کە هەڵیگرتوەو بردوویەتی بۆ لای پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا من تۆ دەکەم بە شایەد کە ئەوەو ئەوەم لە ماڵ و سامانی خۆم داوە بە نوعمان! (پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ئایا ئەو شتانەت بە هەموو منداڵەکانی دیکەت داون؟ گوتوویەتی: نەخێر. (پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: کەسێکی دی غەیری من بکە شایەد. پاشان (پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: ئایا پێتخۆش نیە هەموو منداڵەکانت وەك یەك چاکەکاربن لەگەڵتدا؟ ئەویش گوتوویەتی: با، پێم خۆشە هەموو وەك یەك لەگەڵم چاك بن. پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) فەرمووی: مادام تۆش بۆ هەموویان وەك یەك مامەڵە بکە و دادگەربە لەگەڵیان.

---

(١) صحيح: رواه البخاري في الأدب المفرد.

**بۆ مردنی منداڵ گریاوە**

کاتێك ئیبراهیمی کوڕی وەفات دەکات، فرمێسك لە چاوەکانی بەسەر کوڵم و ڕوومەتە موبارەکەکانی دێنە خوار، دەفەرموێ: ئەی ئیبراهیم! چاوەکان فرمێسکیان لێ دێ و دڵ تەنگ و خەمبارە بە ڕۆیشتنت، یەکێك لە هاوەڵان گوتی: ئایا تۆش دەگریەی؟ فەرمووی: بەڵێ، بەڵام (ولا نقول إلاّ ما يرضى ربّنا)[1]، هیچ شتێك ناڵێین، مەگەر ئەوەی خوا بۆ ئێمە پێی ڕازیە!

**سەردانی منداڵانی دەکرد گەر نەخۆش بوونایە**

ئەنەس (خوا لێی ڕازی بێ)[2]، دەڵێ: مێرمنداڵێکی جوولەکە خزمەتی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) دەکرد، (ڕۆژێك نەخۆش کەوت) پێغەمبەریش سەردانی کردو لە لای سەریەوە دانیشت، پێی فەرموو: مسوڵمان ببە، مێرمنداڵەکەش سەیری باوکی کرد، کە ئەویش لەلای سەریەوە دانیشتبوو، پێی گوت ڕۆڵە گیان: گوێڕایەڵی ئەبو قاسم بکە! منداڵەکەش (ئیمانی هێناو) مسوڵمان بوو، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوای ئەوەی چووە دەر لە ماڵەکە، هەر دەیگوت: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەو مێرمنداڵەی ڕزگار کرد لە ئاگری دۆزەخ. بە ڕاستی ئەمە بەڵگەیە لەسەر سوور بوونی پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) بۆ گرنگی

---

(١) صحيح: رواه البخاري ومسلم.

(٢) صحيح: رواه البخاري.

دانی بە منداڵ و نواندنی سۆزو میهرەبانی و خۆشەویستی بۆ منداڵان و یارمەتی دانیان، هەرچەندە ئەگەر منداڵەکە، یان مێرمنداڵەکە مسوڵمانیش نەبووبێ.

سبحان الله!

کاتێ سەرنج دەدەی و ڕادەمێنی، دەبینی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) بەشێك لە کاتی خۆی تەرخان کردوە بۆ منداڵان و، گرنگی پێدانیان، لەگەڵ منداڵان باوکێکی بەسۆزو میهرەبان بووە، پەروەردەکارو مامۆستایەکی حەکیم و کارلەجێ بووە، یاری و گەمەی لەگەڵ کردوون، ئامۆژگاری کردوون و فێری کردوون، دوعای بۆ کردوون و لەگەڵیان بووە لەو کاتانەی پێویستیان پێی بووە.

بێگومان قۆناغی منداڵی قۆناغێکی یەکجار زۆر ناسکە، وە زۆریش گرنگە، کە مامۆستا دەتوانێ لەم قۆناغە کۆمەڵێك بنەماو بەهای زۆر جوانی تێدا بڕوێنی، کە ئەم هەڵوێستانەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەکرێ هەڵوەستەیان لەسەر بکرێ و کاریان لەسەر بکرێ، بۆ پەروەردە کردنی جیلێکی تەواوی کۆمەڵگاو، چاکسازی تێدا کران و پاکسازی تێدا کردنی، وە هەرچی سوودێك هەیە دەرهێنرێ و مامۆستایان وەك مامۆستایەکەیان کە پێغەمبەری خۆشەویستە (صلی الله علیه وسلم) ڕەچاوی بکەن لە پەروەردەکردنی نەوەکانی داهاتوومان.

شان بە شانی گەورەکان، پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) بانگەوازی دەکرد لەگەڵ منداڵان و گەنجەکان.

## هەندێ نیشانەی ڕەوشت جوانی!

هەندێ لە نیشانەکانی ڕەوشت جوانی دەنووسین، بە ئومێدی ئەوەی جێبەجێیان بکەی، بۆ سوودو بەرچاوڕوونی زیاترو خۆ ڕازاندنەوەی باشتر، کە خاوەنی کتێبی: (إحياء علوم الدّين) هێناویەتی:

١- خاوەن شەرم و شکۆبە بەرانبەر گەورەو بچوك.
٢- ئازارت بۆ هیچ کەسێك نەبێ، بە تایبەت منداڵان.
٣- زۆر چاکەکاربە لەگەڵ هاوڕێکانت، گەر نێوانیان تێکچوو، ئاشتیان بکەوە.
٤- هەمیشە ڕاستگۆبە لە کاتی قسە کردن.
٥- کەم قسان بکە، چونکە ئەگەر کەم بڵێی، کەم هەڵە دەکەی.
٦- کردەوەی چاك زۆر ئەنجام بدە، بێزار مەبە لە کۆکردنەوەی پاداشتی خوا.
٧- هەوڵبدە هەڵەت زۆر کەم لێ ڕووبدا لە کردارو گوفتارت.
٨- ئەگەر هەڵەت کرد، زوو داوای لێبوردن بکە.
٩- گران و سەنگین و ئارامگرو لەسەرخۆبە.
١٠- هەر کەس چاکەی لەگەڵ کردی، زۆر سوپاسی بکەو دەستخۆشی لێ بکە.
١١- هێمن و مەندو نەرمونیانبە وەك پێغەمبەری ئازیزمان (صلى الله عليه وسلم).

١٢- داوێن پاك و پارێزراو بە.
١٣- بە سۆز و پەرۆش و دڵسۆز بە بۆ هەموو کەسێك.
١٤- هەرگیز نەفرەت لە کەس مەکەو جنێو بە کەس مەدە.
١٥- قسە لە نێوان خەڵك بە گشتی و، هاوڕێیانت بە تایبەت مەگوازەوە.
١٦- باسی کەس مەکە بە خراپە لە پاشملەدا.
١٧- زۆر بە پەلە پەل و جووڵە جووڵ مەبە.
١٨- ڕق و کینەت لە دڵ نەبێ بەرانبەر خەڵك، بە تایبەت هاوڕێکانت.
١٩- ڕەزیل و چرووك مەبە، دەستکراوەو بەخشندەبە.
٢٠- حەسوودیت نەبێ بەرانبەر هیچ کەسێك، خۆشحاڵ بە بەخۆشیەکانی خەڵك.
٢١- هەمیشە زەردەخەنەت لەسەر لێو بێت و ڕووخۆشبە لەگەڵ خەڵك.
٢٢- خەڵکت لەبەر خوا خۆش بوێت.
٢٣- ئەگەر کەسێکت خۆشنەویست با لەبەر خوا بێت.
٢٤- ئەمانەت پارێزو دەست پاك بە.
٢٥- بەخشندەبە، یارمەتی هەژاران بدە، گەر بە شتێکی کەمیش بێ.
٢٦- پەیوەندی هاوڕێیەتی و خزمایەتی مەپچڕێنە.
٢٧- زۆر ڕێزی میوانان بگرە.
٢٨- چاکەکاربە لەگەڵ دایك و باوکت، وە خۆت دووربگرە لە خراپ بوون لەگەڵیان.
٢٩- گوێڕایەڵی کەسی گەورە بە، ئەگەر ئامۆژگاری باشی کردی.
٣٠- بەبەزەیی و لێبوردەبە لەگەڵ هەموو کەس، بە تایبەت هاوڕێکانت.

# ١ فەرموودە لەبەر بکەو کاری پێ بکە

(رَحِمَ اللهُ مَنْ سَمِعَ مِنِّي حَدِيثاً، فَبَلَّغَهُ كَمَا سَمِعَهُ)(١).

**واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ، کە فەرموودەیەك لە من دەبیستێ، وە دەیگەیەنێ وەك چۆن بیستوویەتی.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ ابن حبان: ٦٧، عن ابن مسعود قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه وسلم) دووعای بۆ تۆ کردوە، کە سەرگەرم و سەرقاڵی لەبەر کردنی فەرموودەکانی.

٢- هەوڵبدە باش بیانخوێنی و لەبەریان بکەی و کاریان پێ بکەی، ئنجا دواتر لە داهاتوو خەڵکیان لێ فێر بکەی.

٣- خەریك بوونت بە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وات لێدەکات زۆرترین صەڵاوات بۆ پێغەمبەر گیان (صلی الله علیه وسلم) بنێری، وە دەبێ زۆر وریا بی لە بڵاوکردنەوەی فەرموودە، چونکە دووعایەکە بۆ ئەو کەسانەیە کە بە جوانترین شێوە بڵاوی دەکەنەوەو ڕای دەگەیەنن، واتە: چۆنیان بیستوە ئاواش دەیڵێنەوە.

٤- دەبێ زۆر گرنگی بە فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) بدەین، چونکە هەرچی فەرموویەتی لە لایەن خواوە پێی گوتراوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ ﴾ النجم.

واتە: موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) لە خۆوە قسان ناکات، بە دڵنیایی ئەوەی دەیڵێ خوای گەورە بۆی ناردوە.

# ٢ خوا مەبەست بوون لە کاری چاك

**(إِنَّ اللهَ لاَ يَقْبَلُ مِنَ الْعَمَلِ إِلاَّ مَا كَانَ لَهُ خَالِصاً، وَابْتُغِيَ بِهِ وَجْهُهُ)[١].**

**واتە: بێگومان خوا ئەو کردەوانە وەردەگرێ، کە تەنها بۆ ڕەزامەندی ئەو ئەنجامدراون.**

---

(١) حسن صحيح: رَوَاهُ النَّسَائِي: ٣١٤٠ ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ (رضي الله عنه).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- هەر کارێکی چاکمان کرد دەبێ تەنها مەبەستمان خوا بێ، جا بیکەینە نیشانە، کارێك کە بۆ خوا دەیکەین، ئەگەر بەڕاستی بۆ خوا بێ، ئەوەیە کە هیچ چاوەڕوانیەکمان لەو کەسە نەبێ، کە چاکەی لەگەڵدا دەکەین.

٢- هەموو ئیش و کارێك، جا دەرس خوێندن بێ لە قوتابخانە، ئیش کردن بێ لە شوێنێك، یارمەتی دانی کەسێك بێ، پێویستە بە جوانی ئەنجامی بدەین.

٣- ئەم فەرموودە جیاکەرەوەیە لە نێوان کاری وەرگیراو لای خواو، کاری وەرنەگیراو لای خوا، بۆیە دەبێ هەموو هەوڵمان لەسەر جەوهەری کارەکان بێ، نەك ڕواڵەتی کارەکان.

٤- هەر قسەیەك ویستمان بیکەین، یان هەر کارێك ویستمان ئەنجامی بدەین، مەبەستمان خوا نەبوو، وا باشە نیەتی خۆمان ساف بکەین، ئنجا ئەنجامی بدەین.

# ٣ ئیسلام و پایەکانی

(بُنِيَ الإِسْلاَمُ عَلَى خَمْسٍ: شَهَادَةِ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللهُ، وَأَنَّ مُحَمَّدَاً رَسُولُ اللهِ، وَإِقَامِ الصَّلاَةِ، وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ، وَالْحَجِّ، وَصَوْمِ رَمَضَانَ)[1].

واتە: ئیسلام پێنج پایەی هەن:

پایەی یەکەم: شایەتمان بەوە کە جگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە، وە موحەممەد پێغەمبەری خوایە.

پایەی دووەم: ئەنجامدانی پێنج نوێژ لە ڕۆژێکدا.

پایەی سێیەم: زەکات دەرکردن لە ماڵ و سامانمان (ساڵێ جارێك).

پایەی چوارەم: حەجی ماڵی خوا (لە هەموو تەمەن یەکجار، ئەگەر توانا هەبوو).

پایەی پێنجەم: گرتنی ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان (لە ساڵێکدا تەنها یەك مانگ).

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ناساندن و پێناسە کردنی ئیسلام لە چەند وشەیەك، بە شێوەکی پوخت.

٢- تەنها بە جێبەجێ کردنی ئەم پایانە، مرۆڤ بە مسوڵمان هەژمار دەکرێ.

٣- بە جێبەجێ کردنی ئیسلام، مرۆڤەکان سەلامەت دەبن لە دونیاو دوارۆژ.

٤- پایەکانی ئیسلام دیوی ئاشکراو پابەندی ئەرکەکانی ئیسلامەو بەرهەمی ئیمانە، چونکە هەر کەس ئیمانی هێناو، پایەکانی ئیمانی بە ڕاست زانی لە دڵەوەو دانی پێداهێنا بە زار، پێویست دەبێ لەسەری ئەو ئەرك و پابەندیانەش جێبەجێ بکات.

## ٤ ئیمان و پایەکانی

**(الإِيـْمَانُ: أَنْ تُؤْمِنَ بِاللَّهِ، وَمَلاَئِكَتِهِ، وَكُتُبِهِ، وَرُسُلِهِ، وَالْيَوْمِ الآخِرِ، وَتُؤْمِنَ بِالْقَدَرِ خَيْرِهِ وَشَرِّهِ)[١].**

**واتە: ئیمان شەش پایەی هەن:**

**پایەی یەکەم: بڕوامان هەبێ بە خوا.**

**پایەی دووەم: بڕوامان هەبێ بە فریشتەکانی خوا.**

**پایەی سێیەم: بڕوامان هەبێ بە کتێبەکانی خوا.**

**پایەی چوارەم: بڕوامان هەبێ بە پێغەمبەرەکانی خوا.**

**پایەی پێنجەم: بڕوامان هەبێ بە ڕۆژی دوایی.**

**پایەی شەشەم: بڕوامان هەبێ بە قەدەری خوا بە چاك و بە خراپییەوە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِم، عَنِ ابْنِ عُمَرَ، عَنْ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ناساندن و پێناسە کردنی ئیمان و پایەکانی بە شێوەکی کورت و پوخت.

٢- ئیمان شەش پایەی هەن، بە بڕوا نەبوون بە یەکێکیان، ئیمان قبوڵ ناکرێ.

٣- هەر کاتێك ئەم پایانەی ئیمان لەسەر کردارو گوفتاری تاکەکانی هەر کۆمەڵگایەك ڕەنگدانەوەیان هەبوو، ئارام و دڵنیا و سەلامەت دەبن.

٤- ئیمانی تەواو واتە: بڕوا بوون بە هەموو ئەو شتانەی کە خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردوون، وە بڕوا بوون و بە ڕاست زانینی هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) بۆی باسکردووین.



# ٥ لــە دینی خـــوا شـــارەزا بە

(مَنْ يُرِدِ اللَّهُ بِهِ خَيْـرَاً يُفَـقِّـهْـهُ فِي الدِّينِ)[١].

**واتە: خوا چاکەی بۆ هەر کەسێك بوێت، لە ئاین تێیدەگەیەنێ و شارەزای دەکات.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البخاري: ١١.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**




١- ( فقه ) واتە: تێگەیشتنێکی قوڵ و دروست لە ئاین، کە ئەمە جیایە لە هـــەبوونی کۆمەڵێك زانیاریی و شارەزایی ڕواڵەتی.

٢- ئەگەر بە دڵسۆزی هەوڵی فێربوونی دین بدەی دڵنیابە خوا خۆشیدەوێی.

٣- ئەگەر یەك ئایەتیش بێت هەوڵبدە بڵاوی بکەیەوە.

٤- گەورەیی زانست و شارەزا بوونت لە ئاین بۆ دەردەکەوێ.

# ٦ تـام و چـێژی ئیمـان بکە

(ثَلَاثٌ مَنْ كُنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلَاوَةَ الْإِيمَانِ: أَنْ يَكُونَ اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِمَّا سِوَاهُمَا..)(١).

**واتە: سێ شت لە هەر کەسێکدا هەبن، ئەو کەسە شیرینی ئیمانی چەشتوە: (یەکێکیان ئەوەیە) خواو پێغەمبەرەکەی لە هەموو کەس خۆشتر بوێت.**

(١) صحيح: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ، عَنْ أَنَسٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەكانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای گەورەو پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە خۆمان و دایكمان و باوكمان و هەموو كەسێك خۆشتر دەوێ.

٢- قسەی هیچ كەسێك بە پێش قسەی خوا (عزوجل)، وە بە پێش قسەی پێغەمبەر گیان (صلى الله عليه وسلم) نەخەین.

٣- نیشانەی خۆش ویستنی خواو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بریتیە لە گوێڕایەڵی كردنیان.

٤- هەر كەسێكیشمان خۆش ویست تەنها لەبەر خوا خۆشمان بوێ.

## ٧ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم) لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ

(لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ والِدِهِ، وَوَلَدِهِ، وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ)[١].

**واتە: هیچ یەکێك لە ئێوە ئیمانی تەواو نیە، هەتا منی لە باوك و دایك و منداڵەکانی و هەموو خەڵك خۆشتر نەوێ.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پێویستە پێغەمبەرمان (صلى الله علیه وسلم) لە خۆمان و دایك و باوك و هەموو کەس خۆشتر بوێ.

٢- خوای گەورە لەسەری پێویست کردووین پێغەمبەرمان (صلى الله علیه وسلم) لە خۆمان خۆشتر بوێ[١].

٣- کاتێك فەرموودە دەخوێنرێتەوە نابێ دەنگمان بەرزتر بکەینەوە لەسەر فەرموودەکە، چونکە ئەم قسانە لە زمانی موبارەکی پێغەمبەرەوە (صلى الله علیه وسلم) هاتوونە دەر، خوای گەورەش فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِىِّ ... ﴿٢﴾ ﴾ الحجرات.

٤- هیچ کەسێك ئیمانی تەواو نیە تاکو پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم)ی لە خۆی خۆشتر نەوێ، کە بێگومان ئەم خۆشەویستیە هۆکارێکە بۆ ئەوەی لە قیامەتیش لەگەڵی دابین، وەك فەرموویەتی: (الْمَرْءُ مَعَ مَنْ أَحَبَّ)[٢]. واتە: مرۆڤ لەگەڵ ئەو کەسە دایە خۆشی دەوێ.

---

(١) ﴿ ٱلنَّبِىُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ ﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب.

(٢) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِي وَمُسْلِم، عَنْ أَبِي وَائِلٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

## ٨ بە قورئان بەرز دەبیەوە

(إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَاماً وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ)(١).

واتە: بێگومان خوا بە هۆی ئەم قورئانەوە کۆمەڵە خەڵکێك بەرزدەکاتەوە، چەندان خەڵکی دیکەش نزم دەکاتەوە.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِم، عَنْ عُمَرَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (خَيْرُكُمْ مَنْ تَعَلَّمَ الْقُرْآنَ وَعَلَّمَهُ)[1]، واتە: باشترینتان ئەو کەسەیە فێری قورئان دەبێ و خەڵکیش فێر دەکات.

٢- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: هەر کەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێ چاکەیەکی بۆ هەیە، هەر چاکەیەکیش بە دە چاکە دەنووسرێ، ناشڵێم (أَلَمْ) هەمووی یەك پیتە، بەڵکو (ئەلیف) پیتێکە و، (لام) پیتێکە و، (میم)یش پیتێکە.

٣- لە ڕۆژی دوایی قورئان خوێنەکان تاجی شانازی لەسەر خۆیان و دایك و باوکیان دەنرێ و جیادەکرێنەوە لە خەڵکی دی.

٤- هەر کەس لە دونیا خەریکی قورئان بێت، هەم لە دونیا سەر بەرز دەبێ و هەم لە دوارۆژ ڕوو سپی و سەرفراز دەبێ، وە هەر کەسێکیش بیەوێ بە غەیری قورئان سەربەرزو سەرفراز بێ، بە دڵنیایی خوا بچووك و نزمی دەکات.



---

(١) صحيح: رَوَاهُ الْبُخَارِي عَنْ عُثْمَان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

## ٩ سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زیندوو بکەوە

**(مَنْ أَحْيَا سُنَّةً مِنْ سُنَّتِي فَعَمِلَ بِهَا النَّاسُ، كَانَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا لا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئاً)[١].**

**واتە: هەر کەسێك سوننەتێکی من زیندوو بکاتەوەو، خەڵکیش کاری پێ بکەن، ئەوە پاداشتی وەك ئەو پێدەگات، بێ ئەوەی لە پاداشتی ئەوان کەم ببێتەوە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ إِبْنُ مَاجَهْ، عَنْ كَثِيرِ بْن عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ عَوْفٍ الْمُزَنِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- زیندوو کردنەوەی سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، وە بڵاوکردنەوەی فەرمایشتەکانی، یەکێکە لە داواکاریەکانی پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم)، وە ئەم فەرموودە زۆر هاندەرمانە لەسەر بانگ کردنی خەڵك بۆ ڕێگەو ڕێبازی خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم).

٢- هەر سوننەتێك بێ، کردارێك بێ، یان فەرموودەیەك، وەك یەکە، گرنگ ئەوەیە بتوانین کاری پێ بکەین و خەڵکی لێ فێر بکەین.

٣- ئەگەر کەسێك کاری بەم فەرموودە کرد کە تۆ بڵاوت کردۆتەوە، بە ئەندازەی ئەو کەسەی کاری پێکردوە تۆ پاداشتت بۆ دەنووسرێ.

٤- دڵنیابە، خۆشویستن بە قسە نیە، بە دڵ و کردەوەیە، ئەگەر کەسێك خۆشەویستی کەسێکی لە دڵ نەبێ، ناتوانێ لە خزمەتی بێ و گرنگی بە کردارو گوفتارەکانی بدات و خەڵکی بۆ بانگ بکات.

# ١٠ دایک و باوکت ڕازی بکە

(رِضَا اللَّهِ فِي رِضَا الْوَالِدِ، وَسَخَطُ اللَّهِ فِي سَخَطِ الْوَالِدِ)[١].

**واتە: ڕەزامەندی خوا لە ڕەزامەندی دایك و باوك دایە، وە تووڕەیی خوا لە تووڕە بوونی دایك و باوك دایە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ إبنُ حِبَّان، عَنْ عَبْدِ الله بْن عُمَر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- چاکە لەگەڵ باوك و دایك لە دوای بەندایەتی بۆ خوا، گەورەترین چاکەیە، هێشاندنی دڵی دایك و باوك، دڵ نارەحەتکردنیان لە دوای هاوبەش بۆ خوا دانان گەورەترین گوناهە.

٢- بزانە هەر کاتێك گوێڕایەڵی خوات کرد لە ئەنجامدانی نوێژەکان و عیبادەتەکان، پاشان دایك و باوکیشت لێت ڕازی بوو، ئەوە نیشانەی ئەوەیە خوا لێت ڕازی بووە (إن شاءالله).

٣- گەورەیی ڕێزگرتنی دایك و باوکت، وە گوێڕایەڵی کردنیان لە چاکەدا، تەنها هۆکارەکەی ئەوەیە تۆ فەرمانێکی خوای گەورەت بەجێهێناوە.

٤- پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دوعای تایبەتی کردوە لە کەسێك، کە لەگەڵ دایك و باوکی خراپەو مافیان پێشێل دەکات.



# ١١ خەڵكت لەبەر خـوا خـۆش بوێ

(مَنْ أَحَبَّ لِلَّهِ وَأَبْغَضَ لِلَّهِ، وَأَعْطَى لِلَّهِ، وَمَنَعَ لِلَّهِ، فَقَدِ اسْتَكْمَلَ الإِيـْمَانَ)[1].

**واتە: هەر کەسێك (خەڵكی) خۆشبوێ لەبەر خوا، وە ڕقیشی لێ بن لەبەر خوا، شتێك ببەخشێ لەبەر خواو، نەیشی بەخشێ و بیگرێتەوە هەر لەبەر خوا، ئەو کەسە بە دڵنیایی ئیمانداریەکەی تەواوە (واتە: ئێمە دەبێ هەموو شتێکمان لە پێناوی خوای گەورە بێ).**

(١) صحيح: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبُو أُمَامَةَ الْبَاهِلِي (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- مسوڵمان هەر کەسێکی خۆش بوێ تەنها دەبێ خوای مەبەست بێ، نەك بەرژەوەندیەکی دونیایی.

٢- ئەگەر رقی لە سیفەت و خوورەوشتی خراپی کەسێکیش بوویەوە، بە هەمان شێوە دەبێ تەنها لەبەر خوای گەورە بێ، نەك لەبەر شتێکی تایبەت بە خۆی.

٣- پێویستە مسوڵمان هەر شتێکی بەخشی مەبەستی خوابێ، ئەگەر دەستیشی گرتەوە لە بەخشین هەر لەبەر خوابێ.

٤- ئەم چوار سیفەتە، پێغەمبەری ئازیز (صلى الله عليه وسلم) وەك نیشانەیەکی تەواوی ئیمانی مسوڵمان دایناون، بۆیە دەبێ زۆر وریا بین لێیان، لە هەمان کاتدا ئەم فەرموودە هۆکارێکە بۆ پتەوکردنی پەیوەندی نێوان ئیمانداران و تۆکمەکردنی کۆمەڵگای مسوڵمانان.

# ١٢ موسوڵمانان خوشك و برای تۆن

**(لَا تَبَاغَضُوا، وَلاَ تَحَاسَدُوا، وكُونُوا عِبادَ اللهِ إِخْوَاناً)[١].**

**واتە: ڕقتان لە یەکتر نەبێت، وە ئیرەیی و حەسوودی بە یەکتر مەبەن، هەمووتان بەندەی خواو برای یەکتربن.**

(١) صحيح: رَوَاهُ البخاري في الأدب المفرد، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ڕق لە یەکتر بوونەوەو حەسوودی بە یەکتر بردن، دەبێنە هۆی پچڕاندنی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان.

٢- لە سێ ڕۆژو سێ شەوان زیاتر مسوڵمان بۆی نیە پەیوەندی بپچڕێنێ لەگەڵ خوشك و برای مسوڵمانی.

٣- پێویستە خۆت دووربگری لەو هۆکارانەی دەبنە هۆی ڕق و کینە دروست کردن، بەڵکو دەست بگرە بەو هۆکارانەی دەبنە مایەی دڵسافی و بێ فرت و فێڵی و خۆشەویستی و سۆز بۆ یەکتر.

٤- حەسوودی ئەوەیە: حەز بکەی نیعمەتێك لە کەسێك لابچێ، ببێتە هی تۆ، بەڵام وا باشە بڵێین: خوایە چۆن ئەم نیعمەتەت بە فڵان کەس داوە، بە منیش بدە.



# ١٣ ستەم لە کەس مەکە

**(الْمُسْلِمُ أَخُو الْمُسْلِمِ، لاَ يَظْلِمُهُ، وَلاَ يَخْذُلُهُ، وَلا يَكْذِبُهُ، وَلاَ يَحْقِرُهُ)[١].**

**واتە: مسوڵمان برای مسوڵمانە، ستەمی لێ ناکات، وە سەرشۆڕی ناکات، درۆی لەگەڵ ناکات، بە سووك تەماشای ناکات.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِم، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئاینی ئیسلام پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە پتەو دەکات، بە قەدەغەکردنیان لە چەند سیفەتێك، وەك: حەسوودی بردن، ڕق لە یەکتر بوونەوە، پشت لە یەکتر کردن، ستەم لە یەکتر کردن، یەکتر سووك کردن، یەکتر بە درۆ دانان و درۆ کردن، کڕین و فرۆشتن لەسەر یەکتر، یەکتر سەرنەخستن، دەستدرێژی کردنە سەرماڵ و ناموسی یەکتر.

٢- قەدەغە کردنی ئەم سیفەتانە لە مسوڵمانان، مانای وایە پێچەوانەی ئەم سیفەتانە لە خۆتاندا بێننە دی، ئەی مسوڵمانان!

٣- ئەم فەرموودە جەختی لەوە کردۆتەوە، پیاوان دەبێ برابن و، ئافرەتانیش خوشك بن.

٤- بێگومان خراپترین سیفەت لەو سیفەتانەی باسکرا، ستەم کردنە، کە تاریکاییەکانی دونیاو دوارۆژە، دەبێ خۆمان زۆر دووربگرین لە ئەنجام دانی کەمترین ستەم.

# ١٤ زمـــانت لە خــراپە بگــرەوە

( أَكْــــثَرُ خَــــطَايَا ابْنِ آدَمَ فِـي لِسَانِهِ )[١].

**واتە: زۆربەی گوناهو هەڵەکانی مرۆڤ بە هۆی زمانەکەیەتی.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير): ١٠٤٤٦، عَنِ ابنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی[1]: مسوڵمان ئەو کەسەیە مسوڵمانان لە زمان و دەستی سەلامەت و پارێزراوبن.

٢- هەموو ڕۆژێك ئەندامەکانی جەستەی مرۆڤ خۆیان دەدەنە دەست زمان و دەڵێن: ئەی زمان ئەگەر تۆ باشبی ئێمەش باشین، ئەگەر تۆش خراپەکاربی ئێمەش وەك تۆین، چونکە ملکەچی گشت فەرمانی تۆین.

٣- هەوڵبدە بە زمانت قسەیەکی چاك بکەی ئەگەرنا بیگرە، چونکە وەك گوتراوە: (مَا الإِنْسَانُ إلاَّ القَلْبُ وَاللِّسَان)، کەواتە: تۆ بە دوو شت ئینسانی، ئەوانیش دڵ و زمانتن، چونکە زمان دەربڕی ئەو شتانەیە کە لە دڵ و عەقڵی مرۆڤدا هەیە.

٤- قسە لەسەر شتێك مەکە کە زانیارییت دەربارەی نیە.

---

(١) (المُسْلِمُ: مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ) رَوَاهُ البُخَارِيُّ، وَمُسْلِم عَنْ جَابِر (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا).

# ١٥ ڕێــزی مــیوان بگــره

( مَنْ كَانَ يُؤْمِنُ بِاللهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ فَلْيُكْرِمْ ضَيْفَهُ )[١].

**واتە: هەر کەسێك بڕوای بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە، بـــا ڕێزی میوانی بگرێت.**

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- لەو فەرموودە دەردەکەوێ ڕێزگرتنی میوان و میوانداری کردن پەیوەستە بە ئیمانی ئینسانی مسوڵمانەوە، بۆیە بەڵگەی بەهێزی ئیمان بریتیە لە زۆر ڕێزگرتنی میوان.

٢- ماوەی مانەوەی میوان لە ماڵان تا سێ ڕۆژ ڕێگەی پێدراوە، دواتر خاوەن ماڵ بۆی هەیە لەوە زیاتر میوانداری نەکات، وە ئەگەر بیکات لە چاکەی خۆیەتی.

٣- تەماشای میوان مەکە لە کاتی نان خواردن، ڕەنگە شەرم بکاو بە مورتاحی نانەکە نەخوات.

٤- سوێند مەخۆ لەسەر میوان بۆ ئەوەی خواردنی زیاتر بخوات.

# ١٦ تــانەدەرو نەفــرینکەر مەبە

**(لَيْسَ الْمُؤْمِنُ بِالطَّعَّانِ، وَلَا اللَّعَّانِ، وَلَا الْفَاحِشِ، وَلَا الْبَذِيءِ)[١].**

**واتە: بڕوادار تانەدەر نیە، نەفرینکەریش نیە، جنێودەریش نیە، زمانی پیسیش نیە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ الترمذي، عَنِ اِبْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- نابێ ئیماندار تانەو تەشەرو توانج لە خەڵك بدات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ وَيْلٌ لِّكُلِّ هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ۝١ ﴾ الهمزة.

ئیبنو تەیمییە دەڵێ: (هُمَزَةٍ لُّمَزَةٍ ) واتە: ئەوانەی زۆر تانە لە خەڵك دەدەن و زۆر عەیب و کەم و کوڕیان لێ دەبیننەوە، وە جیاوازی نێوان ئەم (هُمَزَةٍ ) و (لُّمَزَةٍ ) ئەوەیە: (هُمَزَةٍ ) تانە دانە لە خەڵك بە کردەوە، بۆ نموونە: کە قسان دەکات تۆ پەنجە لە گوێت بدەی، مانای وایە قسەکەی درۆیە! بەڵام (لُّمَزَةٍ ) ئەوەیە بە زمان عەیبی لێ ببینیەوە.

٢- نابێ نەفرینکار بین، چونکە نەفرین کردن کاری خواو پێغەمبەری خوایە لە دونیا، ئەوەش بە مانای دوورخستنەوە دێ لە ڕەحمەتی خوا.

٣- نابێ مسوڵمان زۆرگاڵتەچی بێ و قسەی نەشیاوو هەڵسوکەوتی ناشرین ئەنجام بدات.

٤- نابێ مسوڵمان جنێوفرۆش بێتو، زمانی پیس بێت بە قسەی ناشرین.

# ١٧ دڵ و دەروونت پـــاك بێ

**(أَلَا وَإِنَّ فِي الْجَسَدِ مُضْغَةً، إِذَا صَلَحَتْ صَلَحَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، وَإِذَا فَسَدَتْ فَسَدَ الْجَسَدُ كُلُّهُ، أَلَا وَهِيَ الْقَلْبُ)[١].**

**واتە: ئاگاداربن! لە لاشەدا پارچە گۆشتێك هەیە، ئەگەر چاك بوو، ئەوە هەموو لاشە چاك دەبێ، وە ئەگەر خراپ بوو، ئەوە هەموو لاشە خراپ دەبێ، ئاگاداربن! ئەویش دڵە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البخاري، ومسلم، عَنْ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- دڵت پاك بکەوە لە حەسوودیی و ڕق لێبوونەوەی مسوڵمانان، چونکە ئەو سیفەتانە نەهی لێکراوە، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: حەسوودی بە یەکدی مەبەن، ڕقتان لە یەکدی نەبێتەوە، پەیوەندی لەگەڵ یەکدی مەپچڕێنن، بەندەی خوابن، خوشك و برابن.

٢- دڵت بپارێزە لە وەسوەسە و گومانی خراپ بردن بە خەڵك، گرنگی زۆر بە ناخ و ناوەوەت بدە، چونکە دواجار ئەوەی لێپرسینەوەی لەگەڵ دەکرێ، ناوەڕۆکە نەك ڕواڵەتەکان.

٣- بۆ ئەوەی ئیمانێکی تەواوت هەبێ، دەبێ دڵێکی ڕاستگۆت هەبێ، بۆ ئەوەی دڵیشت ڕاستگۆبێ، دەبێ زمانت ڕاستگۆ بێ.

٤- دڵ شوێنی بڕیاردانە لەسەر کردارو گوفتارەکانت، تکایە تا دڵت ئارام نەبوو لەسەر شتێك، بڕیاری یەکلاکەرەوەی لێ مەدە.



# ١٨ دڵســـــۆزبــە

• ( الْمُؤْمِنُ مِرْآةُ الْمُؤْمِنِ، وَالْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ )[١].

واتە: بڕوادار ئاوێنەی بڕوادارە، وە بڕوادار برای بڕوادارە.

---

(١) حَسَنٌ: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئاوێنە ڕاستگۆیە، چۆنی ئاوات پێ دەڵێ، بۆیە سیفەتی دڵسۆزی لێ دەبینرێ.

٢- مسوڵمان دەبێ ڕاستییەکان نەشارێتەوە، وەك خۆی بیانڵێ، چیت بۆ خۆت پێ خۆشە دەبێ بۆ براکەشت ئاوابی.

٣- ئەگەر ویستت دڵسۆزی خۆت پێشان بدەی بۆ براکەت و ئامۆژگاری بکەی، لە شوێنی چۆڵ و بە تەنیا قسەی لەگەڵ بکە، دوور لە چاوی خەڵك.

٤- پێش ئەوەی ئامۆژگاری براکەت، یان خوشکەکەت بکەی، وا باشە باسی سیفەتە باشەکانی بکەی، تا هاوسەنگی بپارێزی لە قسەکانت.

# ١٩ گومانی باش بە خەڵك ببە

( إِيَّاكُمْ وَالظَّنَّ فَإِنَّ الظَّنَّ أَكْذَبُ الْحَدِيثِ )[١].

واتە: خۆتان لە گومانی خراپ بپارێزن، چونکە گومانی خراپ درۆترین قسەیە.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، وَمُسْلِم.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای گەورە لە قورئان گومانی خراپ بردنی قەدەغە کردووە فەرموویەتی:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞ ﴿١٢﴾﴾ الحجرات.

٢- هەمیشە پاساو بۆ هەڵەی خەڵك بێنەوە، وەك گوتراوە: (إلْتَمِسْ لإخِيكَ سَبْعِينَ عُذَراً) واتە: حەفتا پاساو بۆ براکەت بێنەوە، تا ڕێگە بە نەفست نەدەی گومانی خراپت پێ ببات بەرانبەر براو خوشکانت.

٣- پەلە کردن و گومانی خراپ بردن دوو شتی ناپەسندن، چونکە پەلەکردن دەبێتە هۆی پەشێمان بوونەوە زۆرجاران، بۆیە مرۆڤی عاقڵ هەرگیز بەپەلە هیچ بڕیارێك نادات، وە هەروەها بە هیچ جۆرێك ڕێگە بە خۆی نادات بێ ئەوەی بەرچاوی ڕوون بێ دەربارەی کەسێك گومانی خراپی پێ ببات.

٤- بزانە هیچ دەرگایەك وەك دەرگای گومان بردن بۆ چوونە نێو دڵت کراوەترو فراوانتر نیە! دوای ئەوەی شەیتان هیچی پێ لەگەڵت ناکرێ، دێ گومان و وەسوەسەی خراپت بۆ دێنێ دەربارەی فلان و فیسار، ئایا هەر وا بە ئاسانی ملکەچی دەبی و گوێڕایەڵی دەکەی؟

# ٢٠ زۆر پرسـیـار نەکـردن

**(إِنَّ اللهَ كَرِهَ لَكُمْ ثَلاَثًا: قِيلَ وَقَالَ، وَإِضَاعَةَ الْمَالِ، وَكَثْرَةَ السُّؤَالِ)[١].**

**واتە: بێگومان خوا سێ شتی بۆ ئێوە پێ ناخۆشە: (کەسێك هەر قسان بگێڕێتەوەو بڵێ:) گوتی و گوتیان، وە ماڵ بە فیڕۆدان و زۆر پرسیار کردن.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ مُسْلِمٌ، عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پرسیارکردن بۆ بەدەستهێنانی زانیاریی شەرعی ئاساییە، بەڵکو زۆر باشیشە.

٢- پرسیار لە شتێك مەکە کە پەیوەندی بە تۆوە نیە، لە ڕاستیدا مسوڵمان دەبێ خەریکی کاری جیددی خۆی بێو، بەرنامەی هەبێ بۆ ژیانی خۆی، نەك کەسێکی بێزارکەر بێ بە قسەو قسەلۆك و پرسیاری بێ ماناو، بە فیڕۆدانی ماڵ و سامان.

٣- هەر جۆرە پرسیارێك کە دەزانی سوودێکی دونیایی و دوارۆژی نیە مەیکە.

٤- گەر دەزانی ئەو کەسەی پرسیاری لێ دەکەی پێی ناخۆشە، دروست نیە ئەم بابەتەی لەگەڵ باسبکەی و ئەو پرسیارەی لێ بکەی.

# ٢١ دوعـــا بۆ مسوڵمانـــان بکە

**( مَنْ دَعَا لأَخِيهِ بِظَهْرِ الْغَيْبِ، قَالَ الْمَلَكُ الْمُوَكَّلُ بِهِ: آمِينَ، وَلَكَ بِـمِثْلٍ )[1].**

**واتە: هەر کەسێك دووعا لە پاشملە بۆ برا (یان خوشکەکە)ی بکات، ئەو فریشتەیەی کە پێی ڕاسپێردراوە دەڵێ: ئامین، بۆ تۆش بە هەمان شێوە، (واتە: هەمان دووعا بۆ تۆ دەکات).**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ مُسْلِم، عَنْ أُمِّ الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- هیچ شتێك لە لای خوای بێ وێنە بە ئەندازەی دووعاو پاڕانەوە خۆشەویستترو بەڕێزتر نیە، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لَيْسَ شَيْءٌ أَكْرَمَ عَلَى اللهِ سُبْحَانَهُ مِنَ الدُّعَاءِ)[1]، واتە: هیچ شتێك نیە لە دووعاو پاڕانەوە کردن بەڕێزتربێ لەلای خوای پاك و بێگەرد.

٢- ئەو دوعایەی گرەنتی قبوڵ بوونی دراوە ئەوەیە بەپەنهان و بەنهێنی داوا دەکرێ.

٣- باشترین دووعاو پاڕانەوە بۆ مسوڵمانان ئەوەیە، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:[2] هەر کەسێك (لە خوا بپاڕێتەوەو) داوای لێ خۆشبوون بۆ ئیماندارانی پیاوو ئافرەت بکات، بە ئەندازەی ژمارەی ئیماندارانی پیاوو ئافرەت خوا چاکەی بۆ دەنووسێ.

٤- کاتێك دووعا بۆ کەسێك دەکەی، فریشتەیەك بە تایبەت دانراوە بۆ ئەوەی هەمان دووعات بۆ بکاتەوە.

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ أَحْمَد، وَالبُخَارِيُّ فِي الأدب المفرد، وَالتِّرمِذِيُّ، وَإِبْنُ حِبَّانَ، وَالحَاكِمُ، وَقَالَ: صَحِيح الإِسْنَاد.

(٢) (مَنِ اسْتَغْفَرَ لِلْمُؤْمِنِينَ وَالمُؤْمِنَاتِ كَتَبَ اللهُ لَهُ بِكُلِّ مُؤْمِنٍ وَمُؤْمِنَةٍ حَسَنَةً). رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي "مُسْنَد الشاميين"، قَالَ الهَيْثَمِيُّ: إِسْنَادهُ جَيِّد.

# ٢٢ پــاك و خـاوێنی نیوەی ئیمــانە

( الطُّهُـــورُ شَــطْـرُ الْإِيـمَـانِ )[١].

**واتە: پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِم: ٢٢٣، عَنْ أَبِي مَالِكٍ الْأَشْعَرِيِّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئەمە بەڵگەیە لەسەر گەورەیی و گرنگی خۆ پاك ڕاگرتن، جا ئەم پاك و خاوێنیە، هەم دیوی پەنهان دەگرێتەوە، هەم دیوی ڕواڵەتیش دەگرێتەوە.

٢- ئینسان دەبێ هەم ناخەکەی پاك بێ، پاکی بکاتەوە لە چڵك و چەپەڵی کوفرو شیرك و ڕیاو نیفاق و سیفەتە خراپەکان. وە هەم دەبێ ڕواڵەت و جەستەشی پاك بێ، بۆیە پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) پاك و خاوێنی پەنهانی و ڕواڵەتی بە نیوەی ئیمان داناوە.

٣- دەستنوێژ هەڵگرتن سیفەتێکی شاراوەی ئیماندارانە، کە هەمیشە نیشانەی پاك و خاوێنی پەنهان و ڕواڵەتیە، پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (لاَ يُحَافِظُ عَلَى الْوُضُوءِ، إِلَّا مُؤْمِنٌ)[1]. واتە: تەنها ئیماندار پارێزگاری لە دەستنوێژ هەڵگرتن دەکات.

٤- پاك و خاوێنی لە ئیسلامدا، پاکی لاشە، پۆشاك، داهێنانی ڕیش و ڕێکخستی پرچ و لابردنی هەموو پیسیەکی لاشە دەگرێتەوە.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ إِبْنُ حِبَّان، عَنْ ثَوْبَان (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

# ٢٣ یەکەم پرسیاری دوارۆژ دەربارەی نوێژەکانتە

( إِنَّ أَوَّلَ مَا يُحَاسَبُ بِهِ الْعَبْدُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ صَلاَتُهُ )[١].

**واتە: بێگومان یەکەم شتێك لێپرسینەوەی لەگەڵ بەندەدا لەسەر دەکرێ لە ڕۆژی قیامەت نوێژەکەیەتی.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ النَّسَائِيّ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئەم فەرموودە گەورەیی نوێژمان بۆ دەردەخات، کە بێگومان ناسنامەی مرۆڤی مسوڵمانەو، کۆڵەکەی ئیسلامە.

٢- خوا دەفەرموێ: ﴿حَـٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ ﴿٢٣٨﴾﴾ البقرة[1]، واتە: پارێز لە نوێژەکانتان بکەن.

ئەم ئایەتە چەند واتایەك دەگەیەنێ: لە ڕووی کاتەوە بیانپارێزە، نوێژەکان لە کاتی خۆیاندا ئەنجام بدە، ئاگات لێ بن. لە ڕووی ڕواڵەتەوە بیپارێزەو نوێژەکەت بەو شێوە بکە کە خوا دایناوە، بۆ نموونە: وشەکان کە دەخوێنی بە ڕێك و پێکی بیانخوێنە، ڕکووع و سەجدە و تەحییات، ڕاوەستان و جموجوڵەکان هەموو بە ڕێك و پێکی بن، خۆت مەجوڵێنەو ئاوڕ مەدەوە.

٣- نوێژ نەکردن گوناهێکی یەکجار زۆر گەورەیە، ئەنجام نەدانی هۆکارە بۆ قبووڵ نەبوونی کردەوە باشەکانی دیکە.

٤- دەرەنجامی نوێژ دەبێ بریتی بێ لە کردنی چاکەو خۆ دوورگرتن لە خراپە، چونکە خوا فەرموویەتی[2]: بێگومان نوێژ خاوەنەکەی قەدەغە دەکات لە هەموو قسەیەکی خراپ و لە هەموو کردەوەیەکی خراپ. کەواتە: دەبێ تۆ مادام نوێژکەری ئەگەر بتەوێ نوێژەکەت بپارێزی، دەبێ شوێنەواری نوێژەکەت لە تۆدا پەیدابێ کە بریتیە لە چاکەکردن بەپێی توانا هەموو چاکەکان بکەی، وە خۆت دوور بگری لە هەموو خراپەکان.

---

(١) تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، سوورەتی النساء.

(٢) ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ۗ وَلَذِكْرُ ٱللَّهِ أَكْبَرُ... ﴿٤٥﴾﴾ العنكبوت.

# ٢٤ صەڵاواتەکانمان دەگاتە پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)

**( صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّ صَلاتَكُمْ تَبْلُغُنِي حَيْثُ ما كُنْتُمْ )**[١].

**واتە: صەڵاواتم لەسەر بدەن، چونکە بێگومان صەڵاواتەکانی ئێوەم پێدەگات لە هەر کوێ بن.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ الطَّبَرَانِي في "الكَبِير"، عَنْ عَلِي بْنِ أَبِي طَالِبٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- لە ڕێگەی فریشتەکانەوە صەڵاواتەکانمان دەگەن بە پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم).

٢- لە هەر جێگایەك بووین، بە پێوە بووین، یان بە دانیشتن، یان بە پاڵدانەوە دەتوانین صەڵاوات بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بنێرین.

٣- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاگادارە بە سەلام و صەڵاواتەکانمان.

٤- وەڵامی صەڵات و سەلامەکانمان دەداتەوە.

# ٢٥ چۆنیەتی صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەرمان (صلى الله عليه وسلم)

(اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ، اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ، كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ، إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ)[١].

**واتە: خوایە! ڕەحمەت بڕێژە بۆ سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەر وەك چۆن ڕەحمەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بێگومان تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت، خوایە! پیرۆز بەرەکەت بڕێژە سەر موحەممەد، وە خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، هەروەك چۆن پیرۆز بەرەکەتت ڕژاندە سەر ئیبراهیم و خزم و کەسانی شوێنکەوتووی، بە ڕاستی تۆ سوپاسکراوو خاوەن شکۆو ڕێزیت.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، وَمُسْلِمٌ، عَنْ كَعْبُ بْنُ عُجْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی صەڵاوات ناردن بۆ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)**

١- فەرمانی خوای بەرزت بە جێهێناوە.
٢- دووعات بۆ بەرزتر بوونەوەی پلەو پایەی پێغەمبەر کردوە (الوسیلە).
٣- بە هەر صەڵاوات ناردنێکت، دە صەڵاواتت لەسەر لێ دەدرێ لەلایەن خوا.
٤- دە پلە بەرز دەبیەوە.
٥- دە چاکەت بۆ دەنووسرێ.
٦- دە گوناهو خراپەت لێ دەسڕێتەوە.
٧- دووعات قبووڵ دەبێ ئەگەر سەرەتا صەڵاواتت ناردبێ.
٨- شەفاعەتت بۆ دەکرێ لە ڕۆژی قیامەت.
٩- لە پێغەمبەر نزیك دەبیەوە لە ڕۆژی دوایی.
١٠- خۆشەویستیت بۆ پێغەمبەری ئازیز (صلی الله علیه وسلم) زیاد دەکات.
١١- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەلامت بۆ دەنێرێتەوە.
١٢- بەرەکەت دەکەوێتە تەمەن و ئیش و کارت.
١٣- بەردەوام خوا باست دەکات لە نێو فریشتەکان.
١٤- ڕێگەی چوونە بەهەشتت بۆ خۆش دەبێ.
١٥- نوورێکی تایبەتت دەبێ لەسەر پردی صیراط.
١٦- دڵ توندی و خەم و پەژارەت نامێنێ.

# ٢٦ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشتە جوانەكانی تەواو كرد

• ( إِنَّمَا بُعِثْتُ لأُتَمِّمَ مَكَارِمَ الأَخْلاَقِ )[1].

واتە: من تەنها بۆ ئەوە نێردراوم، ڕەوشتە جوان و چاكەكان تەواو بكەم.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البَيْهَقِي في الكبرى، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئامانجی سەرەکی لە ناردنی ئەم ئاینە، دوای پەرستنی خوای گەورە، بریتیە لە بڵاوکردنەوەی ڕەوشت جوانی بە نێو هەموو دونیادا.

٢- بێگومان ئاینی ئیسلام هەروەك فەرمانمان پێدەکات کە بڕواو بەندایەتیمان بۆ خوای گەورە بێ، بە هەمان شێوە فەرمانمان پێدەکات بە ڕەوشتی بەرزو جوان.

٣- ئەو سیفەتە زۆر تایبەتەی کە ئیسلام بۆی هاتوە بریتیە لە ڕێزگرتن، کە ئەوە سیفەتێکی زۆر گەورەیە، بۆیەش لەم فەرموودە جەخت لەم سیفەتە کراوەتەوە.

٤- پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) خاوەنی بەرزترین ڕەوشت بووە، گەورەترین شایەد بۆ بەرزی خوڕەوشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئەم ئایەتە موبارەکەیە:

﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ ﴾ القلم.

واتە: بێگومان تۆ (ئەی موحەممەد صلى الله عليه وسلم) لەسەر ڕەوشتێکی زۆر گەورەو مەزنی.

# ٢٧ ڕووخـــۆش بـــە

( تَبَسُّمُكَ فِي وَجْهِ أَخِيكَ صَدَقَةٌ )[١].

**واتە: زەردەخەنەو ڕووخۆشیت بۆ براکەت بە چاکە بۆت هەژمار دەکرێ.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ إبن حِبَّانَ: ١٩٥٦، عَنْ أَبِي ذَرٍّ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- یەکێك لە هۆکارەکانی هۆگر بوون و خۆشەویستی خەڵك بریتیە لە ڕوو خۆش بوون.

٢- باشترین ئیمانداریش ئەوەیە کە خەڵك هۆگری خۆی دەکات، خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: (الْمُؤْمِنُ يَأْلَفُ وَيُؤْلَفُ، وَلا خَيْرَ فِيمَنْ لا يَأْلَفُ وَلا يُؤْلَفُ)[1]، واتە: ئیماندار هۆگری خەڵکی (باش) دەبێ و خۆشی دەوێن، خەڵکیش هۆگری خۆی دەکات و (وا دەکات خۆشیان بوێ)، خێر لەو کەسەدا نیە کە هۆگری خەڵکی (باش) نەبێ و خۆشی نەوێن، نەتوانێ خەڵکیش هۆگری خۆی بکاو خۆشیان بوێ.

٣- زۆربەی کاتەکان با ڕووت گەش و خۆشبێ لەگەڵ هەموو کەس.

٤- عەبدوڵڵای کوڕی حارس دەڵێ[2]: هیچ کەسێکم نەبینیوە لە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) زیاتر زارو زمان بە زەردەخەنەتر بووبێ. ئایا ئێمە واین؟ کە پێشمان وایە، شوێن پێ هەڵگری پێغەمبەری خواین؟!

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ الطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط)، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله رَضِيَ الله عَنْهُمَا.

(٢) (مَا رَأَيْتُ أَحَداً أَكْثَرَ تَبَسُّماً مِنْ رَسُولِ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم) رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ، وَصَحَّحَهُ الألباني.

# ٢٨ هەر قسەکت بیست مەیگێڕەوە

• ( كَفَى بِالْمَرءِ إِثْمًا أَنْ يُحَدِّثَ بِكُلِّ مَا سَمِعْ )[١].

**واتە: ئەوەندە بەسە بۆ مرۆڤ کە پێی گوناهبار ببێ، کە هەرچی بیست بیگێڕێتەوە.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

١- نابێ هەر قسەیەکمان بیست یەکسەر بڵاوی بکەینەوە، بەڵکو دەبێ تەئکیدی لێ بکەینەوە، ئایا ڕاستە یان درۆ، خوای گەورەش لەم بارەوە ئاگاداری کردووینەوەو فەرموویەتی:

﴿ إِن جَآءَكُمۡ فَاسِقُۢ بِنَبَإٖ فَتَبَيَّنُوٓاْ ﴿٦﴾ ﴾ الحجرات.

واتە: ئەگەر کەسێکی لادەرو فاسیق هەواڵێکی بۆ هێنان، لێی بکۆڵنەوەو تەئکید بکەنەوە لە ڕاستیەتی هەواڵەکەی ( و یەکسەر بڵاوی مەکەنەوە).

٢- ئەگەر ویستمان قسەیەك بکەین دەربارەی شتێك، با ئەو فەرمایشتە بێنینەوە بیر خۆمان، کە خوا دەفەرموێ:

﴿ مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ﴿١٨﴾ ﴾ ق.

واتە: هەر وشەیەك لە زار دەرچێ حەتمەن (دوو فریشتەی) چاودێرو ئامادە دەینووسن و تۆماری دەکەن.

٣- دڵنیابە تۆ بەرپرسی و پرسیار لێکراوی دەربارەی هەر وشەیەك کە لە زارت دێتە دەر.

٤- هیچ وشەیەك با لە زارت نەیەتە دەر، مەگەر دڵنیابی، کە خێرو پاداشتی دنیاو دوارۆژتی تێدایە.

# ٢٩ قسەت خۆش بێ

( الْكَلِمَةُ الطَّيِّبَةُ صَدَقَةٌ )[١].

**واتە: بە گوتنی قسەیەکی خۆش و باش خێرێکت بۆ دەنووسرێ.**

---

(١) صَحِيح: رَوَاهُ البُخَارِي: ٢٩٨٩، ومسلم: ١٠٠٩، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودەیە:**

١- لە هەموو کردەوەیەك و قسەیەکی چاك پاداشت هەیە، جا ئەم کردەوەو قسەیە کەم بێ، یان زۆر، بچوك بێ یان گەورە.

٢- قسەی خۆش هۆکارێکە بۆ دڵخۆش کردنی بەرانبەر، یەکێك لە کارە زۆر گەورەکان، کە پاداشتی زۆری لەسەرە، بریتیە لە دڵخۆش کردنی خەڵك، قسەی خۆش باشترین نوێنەرە، بێ لە دەرگادان دەچێتە دڵی کەسی بەرانبەرمان.

٣- وشەی (طیب)ی بەکارهێناوە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ قسەکانمان دەبێ، پاك بن و لە زارێکی پاك بێنەدەر، وە چاك بن و سوودبەخش بن.

٤- گوتراوە: (اطْلُبُوا الحَوَائِجَ عِنْدَ حِسَانِ الْوُجُوهِ)، داوای پێویستیەکانتان لە کەسانی دەم و چاو جوان و ڕووگەش و خۆش بکەن، چونکە ئەگەر داواکەشتی پێ جێبەجێ نەکرێ، بە ڕووێکی خۆش و بە قسەیەکی جوان وەڵامت دەداتەوە.

# ٣٠ مامـەڵــەت خـۆش بێ

**( اتَّقِ اللَّهِ حَيْثُمَا كُنْتَ، وَأَتْبِعِ السَّيِّئَةَ الْحَسَنَةَ تَمْحُهَا، وَخَالِقِ النَّاسَ بِخُلُقٍ حَسَنٍ )[1].**

**واتە: لە هەر شوێنێك بووی پارێز لە خوا بكە (واتە: ترسی خوات لە دڵ بێ)، لە دوای خراپەدا چاكە بكەو (چاكەكەت خراپەكەت) دەسڕێتەوە، وە لەگەڵ خەڵكدا بە ڕەوشتی جوان مامەڵە بكە.**

---

(١) حَسَنٌ: رَوَاهُ أحمد، عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قال شعيب الأرنؤوط: حسن لغيره.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- حەز دەکەی خەڵك زۆر ڕێزت بگرن؟ زۆریان ڕێز بگرە.

٢- حەز دەکەی کە قسان دەکەی خەڵك بە گرنگی پێدانەوە گوێت بۆ بگرن؟ کاتێ قسەیان بۆ کردی بە گرنگی پێدانەوە گوێیان بۆ بگرە.

٣- لە هەر شتێکی دی حەز دەکەی خەڵك چۆنت مامەڵە لەگەڵ بکەن، سەرەتا بۆ خۆت ئاوابە، چونکە کەسی بەرانبەر هەمیشە چاوەڕێی هەڵوێست و هەڵسوکەوتی تۆ دەکات.

٤- با هەرگیز حەسوودی و ڕق و کینەو توندی و هەر سیفەتێك کە ناشیرینت دەکات لێت بە دی نەکرێت، هەروەك چۆن حەز ناکەی ئەو سیفەتانە لە کەسی بەرانبەر بە دی بکەی.

# ٣١ تەرازووی چاکەکانت قورس بکە

**( مَا مِنْ شَيْءٍ أَثْقَلُ فِي المِيزَان مِنْ حُسْنِ الْخُلُقِ )[١].**

**واتە: هیچ شتێك نیە لە تەرازووی (کردەوە چاکەکاندا) قورستربێ لە ڕەوشت جوانی.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- مرۆڤ بە ڕەوشتی جوان لە دونیاو دوارۆژ پلەی بەرز دەبێتەوە، خۆشەویست دەبێ لای خوا، وە لای خەڵك.

٢- ڕەوشت جوانی هۆکارێکە بۆ قورس بوونی تای تەرازووی چاکەکانمان لە دوارۆژ.

٣- باشترین شێوازی بانگەواز کردن ڕەوشت جوانییە، چونکە بانگەوازێکە بەبێ قسە کردن و ماندوو بوون و، هیچ خەرجیەکی ناوێ.

٤- تا لە دوارۆژ تەرازووی چاکەت قورس بێ، دەبێ لە دنیا هەوڵدەی ڕەوشتت گەلێ بەرزبێ.

# ٣٢ سوپاسگوزار بە

(مَنْ لَمْ يَشْكُرِ النَّاسَ لَمْ يَشْكُرِ اللهَ عَزَّوَجَلَّ )[١].

واتە: هەر کەس سوپاسی خەڵك نەکات، (کە چاکەیان لەگەڵ کردوە) ئەوە سوپاسی خوای گەورەی نەکردوە.

---

(١) صحيح: رَوَاهُ أَحْمَد، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَقَالَ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای گەورە لە قورئاندا کە باسی سوپاسگوزاری بەندەکانی بۆ نیعمەتەکانی دەکات، بە گلەیی و سەرزەنشتەوە دەفەرموێ:

﴿ وَقَلِيلٌ مِّنۡ عِبَادِيَ ٱلشَّكُورُ ﴿١٣﴾ ﴾ سبأ.

واتە: وە ژمارەیەکی زۆر کەم لە بەندەکانم سوپاسگوزارن.

٢- لە بیر نەکەی، زۆر سوپاسی ئەو کەسانە بکە کە چاکەیان لەگەڵ کردووی، بە باشترین شێوە پاداشتی ئەو کەسە بدەوە کە چاکەی لەگەڵ کردووی، پێی بڵێ: (جَزَاكَ اللهُ خَيْراً)[1].

٣- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی[2]: هەر کەس سوپاسگوزاریی (لەسەر شتی) کەم نەکات، سوپاسگوزاریی (لەسەر شتی) زۆریش ناکات، بۆیە تۆ لە سەر چاکەی زۆر بچووکیش، زۆر سوپاسی چاکەکار بکە.

٤- سوپاسگوزاری نیعمەت بەوە دەکرێ باسی نیعمەتەکە بکەی و، هەوڵیش بدەی لە ڕەزامەندی خوا بەکاری بێنی.

---

(١) (مَنْ صُنِعَ إِلَيْهِ مَعْرُوفٌ، فَقَالَ لِفَاعِلِهِ: جَزَاكَ اللهُ خَيْراً، فَقَدْ أَبْلَغَ فِي الثَّنَاءِ)، صحیح: رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ.

واتە: هەر کەسێك کە چاکەیەکی لەگەڵ کرا، بە چاکەکارەکەی گوت: (جَزَاكَ اللهُ خَيراً)، ئەوە بە باشترین شێوە سوپاس و ستاییشی کردووە.

(٢) (مَنْ لاَ يَشْكُرُ الْقَلِيلَ لاَ يَشْكُرُ الْكَثِيرَ) حَسَـنٌ: رَوَاهُ البَيْهَقِيُّ فِي (شعب الإيمان).

# ٣٣ سـادەو خـاکی بە

( مَنْ تَوَاضَعَ لِلهِ إِلاَّ رَفَعَهُ اللهُ )[١].

**واتە: هەر یەکێك لەبەر خوا بێ فیزو خاکی بێ، بە دڵنیایی خوا بەرزی دەکاتەوە.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ مُسْلِم، وأبو نعيم في (الحلية)، واللفظ لأبي نعيم.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای باڵادەست فەرمانی پێکردووین سادەو خاکی بین، وە هەڕەشەشی لێکرووین ئەگەر خۆ بە گەورە ببینین.

٢- سادە بوون بەرانبەر خوا مانای ملکەچی بۆ فەرمانی خوا دەگەیەنێ و حیکمەت و داناییش بە خاوەنەکەی دەبەخشێ.

٣- هەمیشە خوا خۆ بەگەورەزانان تووشی زەلیلی دەکات، دەڵێن: ڕۆژێك پیاوێکی خۆ بە گەورەزان زۆر مەدحی خۆی دەکات و دەڵێ: من هەرگیز شتم لە بیر ناچێ! دوایی کە دەیەوێ بڕوات دەڵێتە خزمەتکارەکەی ئەو نەعلانەم بۆ بێنە، خزمەتکارەکەش پێی دەڵێ: گەورەم نەعلەکان وا لە پێتن!

٤- سادەو خاکی بوون بەرانبەر خەڵك دەبێ لەبەر خوای بەرزبێ.

# ٣٤ یارمەتیدەر بە

( إِنَّ اللهَ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ )(١).

**واتە: بێگومان خوا لە یارمەتیدانی بەندە دایە، ئەوەندەی بەندە لە یارمەتیدانی برا (و خوشکە)کەی دابێ.**

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ أَحْمَد، وَمُسْلِم، وَأَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای گەورە داوامان لێدەکات هاوکاری یەکتریین لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی.

٢- دڵنیابە کاتێك تۆ یارمەتی هەر کەسێك دەدەی، خوای باڵادەست یارمەتیت دەدات.

٣- هاوکاری کردنی برای مسوڵمانی خۆت مەرج نیە هەر ماددی بێ، دەگونجێ بە وشەو تەعبیر بێ، بۆ نموونە: کاتێك کێشەکی هەیە هەوڵبدە لەسەری سووك بکەی، قسەی وای بۆ بکە لە خەم و خەفەتی کەم بکەیەوە، کە خۆشی هەیە لەگەڵی بەشداربە ئەوەش هاوکارییە، بۆ چوونە شوێنێك پێویستی پێتە لەگەڵی برۆو یارمەتی بدە مادام بۆ کاری چاکە.

٤- ئیماندار بۆ ئیماندار وەك دیوار وایە، هەندێکی هەندێکی توندو پتەو دەکات.



# ٣٥ ڕاســـتگـۆ بە

**( عَلَيْكُمْ بِالصِّدْقِ فَإِنَّ الصِّدْقَ: يِهْدِي إِلَى الْبِرِّ، وَإِنَّ الْبِرَّ يَهْدِي إِلَى الْجَنَّةِ )[١].**

**واتە: داواتان لێدەکەم ڕاستگۆبن، بێگومان ڕاستگۆیی ڕێنمایی دەکات بۆ (هەموو کردارو گوفتارێکی) چاکە، وە چاکەش ڕێنمایی دەکات بۆ بەهەشت.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِيُّ، وَمُسْلِم، عَنِ ابْنِ مَسْعُودٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- هەر کەس لەگەڵ خوا ڕاست بێ، لەگەڵ خەڵکیش ڕاستگۆ دەبێ.

٢- مرۆڤی ڕاستگۆ خوا هەر لە دونیادا بەرهەمی ڕاستگۆیی پێشان دەدات.

٣- ئەگەر ئیماندارێکی تەواوی و دەتەوێ بە ڕاستی گوێڕایەڵی فەرمانی خوا بکەی، برادەرایەتی لەگەڵ ڕاستگۆیاندا بکە، چونکە خوا فەرمانی پێکردووی و فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَكُونُوا۟ مَعَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾ ﴾ التوبة.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەن و لەگەڵ ڕاستگۆیانبن.

٤- ڕاستگۆی لە ژیانی دونیا هۆکاری بە دەستهێنانی متمانەی خەڵك و بەرەکەتی خوایە.

# ٣٦ ئاسانکار بە لە ژیــن و دیــن

( بَشِّرُوا وَلاَ تُنَفِّرُوا وَيَسِّرُوا وَلاَ تُعَسِّرُوا )[١].

**واتە: موژدە بە خەڵك بدەن و نزیکیان بکەنەوەو دووریان مەخەنەوە (لە دینداریی)، وە ئاساکاربن، قورسی مەکەن (لە دینداریی).**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ مُسْلِم، وَأَبُو دَاوُدَ، عَنْ أَبِو مُوسَى (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- مسوڵمانان لە کاروباری دنیاو دوارۆژیاندا وا باشە هەمیشە لایەنی ئاسانکاریی بگرنە بەر، لە چوار چێوەی شەرع.

٢- کاتێك سەیری قورئان دەکەین دەبینین خوای بەبەزەیی هەمیشە دەیەوێ کاروباری دینداری بۆ مسوڵمانان ئاسان بکات.

٣- وە پێویستە باسی شتێك نەکرێ کە نەچێتە عەقڵی کەسی بەرانبەر.

٤- پێویستە لە کڕین و فرۆشتن و گشت مامەڵەکان ئاسانکاربی، تا ئەو دووعایەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بتگرێتەوە کە دەفەرموێ: (رَحِمَ اللهُ عَبْدَاً سَمْحَاً إِذَا بَاعَ سَمْحَاً إِذَا اشْتَرَى سَمْحَاً إِذَا اقْتَضَى)[1]، واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێ کە ئاسانکارە کاتێك کە (شتێك) دەکڕێ، کاتێك کە (شتێك) دەفرۆشێ، کاتێك مافێکی هەیەو داوای دەکاتەوە (یان دادوەری دەکات لە نێوان دوو کەس بە داد گەری).

---

(١) صَحِيح: رَوَاهُ إبنُ مَاجَه، عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ الله (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا).

# ٣٧ خـــاوەن شـــەرم و شكۆ بە

( الحَيَاءُ مِنَ الإِيـْمَانِ، وَالإِيـْمَانُ فِي الجَنَّةِ )[١].

**واتە: شەرمنی لە ئیمانەوەیە، وە (خاوەن) ئیمانیش لە بەهەشتە.**

---

(١) صَحيح: رَوَاهُ التِّرمِذِيّ، عَن أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوا لە هەموو کەس شایستەترە شەرمی لێ بکەی.

٢- نابێ شەرم کردن وا لە مسوڵمان بکات داوای بە دەستهێنانی زانیاریی نەکات، قەتادە (ڕەحمەتی خوای لێ بێ) دەڵێ: (لا يَتَعَلَّمُ العِلْمَ: مُسْتَحيٍ، ولا مُسْتَكبِرٌ)[1] واتە: دوو کەس فێری زانست و زانیاری نابن: کەسی شەرمن، وە کەسی خۆ بە گەورەزان و لە خۆبایی!

٣- هەر کەس بەپۆشاکی حـەیا بپۆشرێ، لەبەر چاوی خەڵك عەیبی دەپۆشرێ.

٤- هەموو پێغەمبەران بە خەڵکی دەوروبەری خۆیان فەرموە: (إِذَا لَمْ تَسْتَحِ فَاصْنَعْ مَا شِئْتَ)[2]، واتە: ئەگەر شەرم و حەیات نەبوو، ئیدی چی دەتەوێ بیکە!

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ البُخَارِيُّ في باب: الحياء في العلم.

(٢) صَحِيحٌ: رَوَاهُ البُخَارِيُّ عَنْ أَبُو مَسْعُود (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

# ٣٨ ئاسانکارو نەرم و نیان بە

( مَنْ كَانَ سَهْلاً هَيْنَاً لَيناً حَرَّمَهُ اللهُ عَلَى النَّارِ )[١].

**واتە: هەر کەسێك ڕەوشت و ئاکاری ئاسان بێت و، لەسەرخۆو، نەرم و نیان بێ، خوا ئاگری دۆزەخی لەسەر قەدەغە دەکات.**

---

(١) صَحيح: رَوَاهُ الحَاكِمُ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَة (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم.

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- نەرم و نیانی یەکێکە لە سیفەتەکانی خوای بەرزو بێ وێنە، تۆش هەوڵبدە بە پێی تواناو لە قەدەر خۆت ئەو سیفەتە لە خۆتدا بەرجەستە بکەی.

٢- نەرم و نیانی هۆکاری کەم هەڵە کردنتە، چونکە کەسی نەرم و نیان زوو بڕیار نادات.

٣- گەر نەرم و نیان بی لای خەڵك جوان دەبی، چونکە ئەو سیفەتە لە هەر کەسێکدا هەبێ حەتمەن جوانی دەکات، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: نەرم و نیانی لە هەر شتێکدا هەبێ جوانی دەکات، وە لە هەر شتێك نەبێ ئیللا ناشیرینی دەکات.

٤- نەرم و نیانی خۆ ماندووکردنی دەوێ، وە خۆڕاهێنانی دەوێ، شتێك نیە بچی بیکڕی، یان بیپۆشی، وەك پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: وە نەرم و نیان بوون بە خۆڕاهێنانە لەسەری.

# ٣٩ خەڵات خۆشەویستی زیاد دەکات

**( تَــهَـــادَوا تَـحَـــابُّوا )[(١)].**

- **واتە: دیاری و خەڵات ببەخشن بە یەکتر، چونکە خۆشەویستی نێوانتان زیاتر دەکات.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَاري فِي الأدب المفرد: ٥٩٤، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- گەورەترین و باشترین ڕێگە بۆ بە دەست هێنانی خۆشەویستی خەڵات و دیارییە.

٢- دیاری و خەڵات کە نیشانەی خۆشەویستییە، لە هەمان کاتدا هۆکاری نەهێشتنی ڕق و تووڕەیی و حەسوودی و، هەرچی سیفەتی خراپە لە دڵی کەسی بەرانبەر.

٣- پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) خەڵات و دیاری وەردەگرت و پاداشتی خاوەنەکەشی دەدایەوە لەسەری، هەرچی لەلا هەبووایە دەیدا بە خاوەن دیارییەکە.

٤- ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە پتەوکردنی پەیوەندی نێوان مرۆڤەکان و توندو تۆڵ کردنی.



# ٤٠ هەر کارێکت کرد بە جوانی بیکە

( إِنَّ اللهَ يُحِبُّ إِذَا عَمِلَ أَحَدُكُمْ عَمَلاً أَنْ يُتْقِنَهُ )[١].

**واتە: بێگومان خوا پێی خۆشە ئەگەر یەکێکتان کارێکی کرد، بە وردەکاریی و پوختی و ڕێکی ئەنجامی بدات.**

---

(١) حسن: رَوَاهُ البَيْهَقِي في شعب الإيمان، عَنْ عَائِشَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهَا).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

**١- ئەم فەرموودە هانمان دەدات لەسەر ئەوەی هەر کارێکمان کرد، بەجوانی و ڕێك و پێکی ئەنجامی بدەین.**

**٢- بێگومان هەر کارێك کە بە ڕێك و پێکی ئەنجام بدرێ، دەرەنجامێکی زۆر باشی دەبێ.**

**٣- بەجوان ئەنجامدانی کارەکانت، خۆشەویستی خوای گەورە بەدەست دەهێنی.**

**٤- مەبەست لەم کارە، تەنها بواری دینداریی نیە، بەڵکو هەر کارو کردەوەیەکی دین و دونیا دەگرێتەوە.**

# ٤١ کە چووی بۆ شوێنێك سڵاو بکە

**(لاَ تَدْخُلُونَ الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤْمِنُوا، وَلاَ تُؤْمِنُوا حَتَّى تَحَابُّوا، أَوَلاَ أَدُلُّكُمْ عَلَى شَيءٍ إِذَا فَعَلْتُمُوهُ تَحَابَبْتُمْ؟ أَفْشُوا السَّلاَمَ بَيْنَكُمْ)[1].**

**واتە: ناچنە بەهەشت تا ئیمان نەهێنن، وە ئیمانیش ناهێنن تا یەکترتان خۆشنەوێ، ئایا کارێکتان پێ بڵێم ئەگەر ئەنجامی بدەن بە هۆیەوە یەکترتان خۆشدەوێ؟ لە نێو خۆتاندا سەلام بڵاو بکەنەوە.**

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ مُسْلِم، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- سڵاوکردنت لە خەڵکی نیشانەی ئیمانداری و دڵپاکی و دووریتە لە ڕق و کینە.

٢- سڵاوکردنت لە خەڵکی هۆی خۆشەویست بوونتە لە لای خەڵك.

٣- هەتا دەتوانی لە کاتی سڵاو کردن ناوی ئەو کەسە بێنە کە سڵاوی لێدەکەی، وە بە زەردەخەنەوە وشەکانت لە زار دەربچن.

٤- کە خەڵکت خۆشویست لەبەر خوا، خەڵکیش تۆیان خۆشویست لەبەر خوا ئەوە ڕێگایەکی چوونە بەهەشتت گرتۆتە بەر، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: خوا فەرموویەتی: ئەوانەی لەبەر گەورەیی من یەکتریان خۆشدەوێ، شوێنی نوورینیان هەیە (لە دوارۆژ) کە پێغەمبەران و شەهیدان خۆزگەیان پێ دەخوازن.

# ٤٢ چاك و چۆنی و تەوقە بكە

**( مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ إِلاَّ غُفِرَ لَهُمَا قَبْلَ أَنْ يَفْتَرِقَا )[١].**

**واتە: هەردوو مسوڵمانێك بەیەكگەیشتن، تەوقە لەگەڵ یەكتر بكەن، بە دڵنیایی پێش ئەوەی لە یەكتر جیاببنەوە خوا لە گوناهی هەردووكیان خۆش دەبێ.**

---

(١) صَحِيحٌ: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، عَنِ الْبَرَاءِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- کە تەوقەت لەگەڵ کەسێك کرد تۆ زووتر دەستت بۆ دەستی ببە، تا لەو ڕێگەوە خۆشەویستی و سادەیی خۆتی بۆ دەربخەی.

٢- کە دەستت خستە ناو دەستی کەسێك، دەستی توند بگرەو یەکسەر دەستت لە دەستی دەرمەهێنە.

٣- تەوقەکردن لەگەڵ ئافرەتان حەرامە بە هیچ جۆرێك دروست نیە (جگە لە دایك و خوشك و پلك و پور).

٤- ئەگەر بمانەوێ چاو لە پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله علیه وسلم) بکەین، دەبێ زۆر گەرم و گوڕ بین، هەم لە چاك و چۆنی کردن، هەم لە سڵاوو تەوقە کردن.



## ٤٣ کە یەکێك لە مەجلیس هەڵسا، مەچوو بۆ شوێنەکەی

(إِذَا قَامَ أَحَدُكُمْ مِنْ مَجْلِسِهِ، ثُمَّ رَجَعَ إِلَيْهِ، فَهُوَ أَحَقُّ بِهِ)[١].

**واتە: ئەگەر یەکێکتان لە شوێنی دانیشتنی خۆی هەڵسا (لە کۆڕو مەجلیس)، دوایی هاتەوە بۆ ئەو شوێنە، ئەوە خۆی بەو شوێنە شایستەترە.**

(١) صحيح: رَوَاهُ مسلم: ٢١٧٩، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەم فەرموودە ئەم جۆرە ڕەفتارەی لە ئێمەی مسوڵمان قەدەغە کردوە.

٢- ئاینی ئیسلام، ئاینێکی گشتگیرەو تەواوی بوارو هەڵسوکەوتەکانی ژیان دەگرێتەوە، بە جێبەجێ کردنی، ژیانی هەموو دروستکراوەکان ڕێکخراو دەبێ.

٣- هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێن: ئێمە کە دەچووینە خزمەت پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) یەکێك لە ئێمە دەچوو لەو شوێنە دادەنیشت، کە کۆتایی کۆڕو مەجلیسەکەیە.

٤- لە ئاینی ئیسلام هەموو ماف و ئەرکەکان دیاریکراون و دراون، تەنانەت ئەگەر مافێکی بچوکیش بووبێ، لە بیر نەکراوە، وەك لەم فەرموودە شیرینە دەردەکەوێ.

# ٤٤ مۆڵەت وەردەگرین بۆ چوونە ماڵان

**( إِنَّمَــا جُعِــلَ الْإِذْنُ مِنْ أَجْــلِ الْبَصَــرِ )[١].**

**واتە: مۆڵەت وەرگرتن تەنها لەبەر سەیر کردن دانراوە (واتە: بۆ ئەوە مۆڵەت وەردەگیرێ تاکو ڕاستەوخۆ سەیری نێو ماڵی خاوەن ماڵ نەکرێ).**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِم: ٢١٥٦، عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ السَّاعِدِيّ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- مۆڵەت وەرگرتن بۆ چوونە نێو ماڵ یەکێکە لە ئەدەبە هەرە گەورەکان، چونکە خوای گەورە بە تایبەت ئایەتی قورئانی لەسەر دابەزاندوە، دروست نیە بێ مۆڵەت وەرگرتن بچینە نێو هیچ ماڵێك.

٢- پێش چوونە نێو ماڵ، کە لە پێش دەرگا دەوەستین، بەرانبەر دەرگا ناوەستین، بەڵکو لەلای ڕاست، یان لای چەپ دەوەستین، بۆ ئەوەی کە دەرگا کراوە، ڕاستەوخۆ نێو ماڵەکە نەبینین.

٣- پێویستە زۆر بە نەرمی لە دەرگا بدەین، ئەگەر دەرگا کراوە، سەرەتا سڵاو دەکەین، ئەگەر مۆڵەت هەبوو، ئنجا دەچینە ژوورەوە، ئەگەرنا دوای سێ جار لە دەرگادان، پێویستە بگەڕێینەوە.

٤- ئەگەر لە ژوورەوە گوترا کێیە؟ پێویستە ناوی خۆمان بڵێین، تا بناسرێین.

# ٤٥ لە نێوان دوو کەس دامەنیشە بێ مۆڵەت وەرگرتن

**( لَا يَحِلُّ لِرَجُلٍ أَنْ يُفَرِّقَ بَيْنَ اثْنَيْنِ، إِلَّا بِإِذْنِهِمَا )[١].**

**واتە: بۆ کەس دروست نیە لە نێوان دوو کەسدا دابنیشێ، مەگەر مۆڵەتیان لێ وەربگرێ.**

---

(١) حسن: رَوَاهُ الترمذي: ٢٧٥٢، في الأدب المفرد، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو (رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئەم فەرموودە فێرمان دەکات، دروست نیە بچی لە نێوان دوو کەس دابنیشی بێ ئەوەی مۆڵەتیان لێ وەربگری.

٢- پێویستە لەگەڵ یەکتر ئەوپەڕی ڕەچاوکردنمان هەبێ، بە کاتە تایبەتەکان و کەسە تایبەتەکان، ڕەنگە دوو کەس حاڵەتەکەیان وا پێویست بکات بە تەنیابن، ناکرێ ئێمە ئەو تایبەتمەندیە لەوکاتەدا ڕەچاو نەکەین.

٣- ئەم مۆڵەت وەرگرتنە بۆ چوونە شوێنێك، یان چوونە نێوان دوو کەس، یان بۆ هەر شوێن و هەر مەبەستێك بێ، یەکێکە لە ڕەوشت و ئەدەبە هەرە جوانەکان.

٤- مسوڵمانان مافیان لەسەر یەکتر زۆرە، دەبێ ئاگاداربن، مافەکانی یەکتر پێشێل نەکەن.

# ٤٦ ئەگەر سێ کەس بوون، با دوو کەس پێکەوە چپە نەکەن

**( إِذَا كُنْتُمْ ثَلَاثَةً، فَلَا يَتَنَاجَى اثْنَانِ دُونَ الثَّالِثِ، فَإِنَّهُ يُحْزِنُهُ ذَلِكَ )[١].**

**واتە: ئەگەر سێ کەس بوون، با دووان پێکەوە بە چپەو نهێنی قسەی نەکەن و، خۆیان لە کەسی سێیەم جیانەکەنەوە، چونکە ئەو (ڕەفتارە) دڵتەنگی دەکات.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ البُخَارِي: ١٢٨٨، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بن عمر (رَضِيَ اللهُ عَنْهما).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- ئەگەر زیاتر بوون لە سێ کەس ئاساییە دوو کەس بە تەنیاو بە نهێنی قسان بکەن، واتە: کە تێکەڵ بە خەڵك بوون، چونکە کەسی سێیەم دەتوانێ لەگەڵ یەکێکی دیکە قسە بکات.



٢- ئاینی ئیسلام زۆر ڕەچاوی هەست و شعوری مرۆڤی کردوە، هۆکاری گوترانی ئەم فەرموودە ئەوەیە، کەسێك هەست بە دڵتەنگی نەکات و، دڵناڕەحەت نەبێ، ڕەنگە وا گومان ببات، کە ئەو دوو کەسە باسی ئەو بکەن، یان بڵێ: دەبێ چ شتێك هەبێ لە من پەنهانی بکەن و بیشارنەوە؟!

٣- بێگومان ئەم ڕەفتارە پێچەوانەی ئەدەبی کۆڕو مەجلیسە، کە کاتێك سێ کەس پێکەوە دادەنیشن، دووانیان پێکەوە قسە بکەن بە نهێنی.

٤- ئەو جۆرە ڕەفتارە زۆر جار دەبێتە هۆی دروستبوونی کێشەو پچڕانی پەیوەندی نێوان هاوڕێ و دۆستە زۆر نزیك و خۆشەویستەکان.

# ٤٧ هـــاوڕێی بـــاش هـــەڵبژێره

﴿ الرَّجُلُ عَلَى دِينِ خَلِيلِهِ، فَلْيَنْظُرْ أَحَدُكُمْ مَنْ يُخَالِلُ ﴾[١].

**واتە: مرۆڤ لەسەر ئاینی هاوڕێکەیەتی، بۆیە هەر یەکێك لە ئێوە با سەیر بکات، بزانێ کێ دەکاتە خۆشەویست و هاوڕێی خۆی؟**

---

(١) حسن: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ، والتِّرمِذِي: ٣٤٨٤، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- بە زۆری وایە کە مرۆڤ لە سەرەتای تەمەنیەوە ئەگەر دۆست و برادەرێکی باشی لێ هەڵکەوت، بەرەو باشە دەچێ، ئەگەر خوانەخواستە تووشی دۆست و هاوەڵێکی خراپ بوو، بەرەو خراپە پەلکێش دەبێ.

٢- هاوڕێیەتی کەسی خراپ ناکەین، چونکە لێیەوە فێری کردارو گوفتاری خراپ دەبین.

٣- برادەرەکان هەمیشە کاریگەریان لەسەر یەکدی هەیە، جا کامەیان بەهێزتر بێ ئەویان کاریگەری زیاتر دەبێ، تۆ هەوڵبدە کەسێکی زۆر چاکبی و لەسەر چاکیەت زۆر بەهێزبی، بۆ ئەوەی پێت کاریگەربن، وە من پێم وایە پاش دڵسۆزیت بۆ خوا، زانیاری و ڕەوشتە بەرزەکان هۆکاری سەرەکین تا بتوانیت کاریگەری دروست بکەی لەسەر برادەرەکانت.

٤- برادەرە باشەکان لە هەموو کاتێك بران، بە تایبەت لە کاتی تەنگانەو ناخۆشی، بۆیە دەبێ بۆ زانین و ناسینی برادەرە باشەکان لە کاتە تایبەتەکان بگەڕێین.

# ٤٨ هەموو کەسێك هەڵە دەکات

• ( كُلُّ بَنِي آدَمَ خَطَّاءٌ، وَخَيْرُ الْخَطَّائِينَ التَّوَّابُونَ )[١].

**واتە: هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، وە باشترینی هەڵەکارانیش، ئەوانەن کە پێداچوونەوە بۆ خۆیان دەکەن و پەشیمان دەبنەوە.**

---

(١) حسن: رَوَاهُ أَحْمَد، عن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

١- خوای گەورە ئێمەی وا دروست کردوە، کە تووشی لە بیر چوونەوەو هەڵەو گوناھ ببین، وە بێگومان هیچ مرۆڤێك نیە دوور بێ لە هەڵە و گوناهان.

٢- پێویستە لەسەرمان کە دەزانین هەڵەیەك، یان گوناهێکمان کردوە، زوو پەشێمان بینەوەو بڕیار بدەین جارێکی تر، کاری لەم شێوە نەکەینەوە، چونکە پەند وەرگرتن لە هەڵە وامان لێدەکات بەرەو پێش بچین.

٣- هەر کات یەکێك هەڵەیەکمان بەرانبەر دەکات، دەبێ هەوڵبدەین پاساوو بیانووی بۆ بێنینەوە.

٤- باشترین کەس، کەسێکە هەڵەی کردوەو دواتر دانی پێداهێناوەو بڕیار دەدات بە چاکەکردن ئەم هەڵەیە قەرەبوو بکاتەوە، داننان بە هەڵە دوورت دەکاتەوە لە لووتبەرزی.

# ٤٩ دوای خواردن و خواردنەوە سوپاسی خوا دەکەین

**( إِنَّ اللهَ لَيَرْضَى عَنِ الْعَبْدِ، أَنْ يَأْكُلَ الأَكْلَةَ أَوْ يَشْرَبَ الشَّرْبَةَ فَيَحْمَدُهُ عَلَيْهَا )[١].**

**واتە: بێگومان خوا بەوە لە بەندەکەی ڕازی دەبێ، ئەگەر خواردنێکی خوارد سوپاسی خوای لەسەر بکات، یان خواردنەوەیەکی خواردەوەو سوپاسی خوای لەسەر بکات.**

---

(١) صحيح: رَوَاهُ مُسْلِمٌ:٢٧٣٤، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەكانی ئەم فەرموودە:**

١- ئەم فەرموودە ئەوەمان فێر دەكات كە سوپاسی خوای گەورە بكەین، چونكە نیعمەت و چاكەی زۆری پێبەخشیوین.

٢- دەبێ ئەم نیعمەتانە بزانین و بناسین بۆ ئەوەی سوپاسی خوای لەسەر بكەین.

٣- باشترین وەفا بۆ كەسێك كە خواردن و خواردنەوەت دەداتێ سوپاسكردنە، خوای گەورەش ئەم دوو نیعمەتەی بە ئێمە داوە، پێویستە هەموو ڕۆژێك چەند جار شوكرو سوپاسی خاوەن ئەم نیعمەتانە بكەین، كە خوای گەورەیە.

٤- بیر كردنەوە لە نیعمەت و چاكەكانی خوای تعالى، دەبێ وامان لێ بكات خۆمان دوور بگرین لە ئەنجامدانی سەرپێچی و گوناهو تاوان.

# ٥٠ هەموومان پێکەوە خواردن دەخۆین

**( فَاجْتَمِعُوا عَلَى طَعَامِكُمْ، وَاذْكُرُوا اسْمَ اللهِ عَلَيْهِ يُبَارَكْ لَكُمْ فِيهِ )[١].**

**واتە: لەسەر خواردنەکانتان کۆببنەوە، وە ناوی خوای لەسەر بێنن، بەرەکەت و پیزی تێدەکەوێ.**

---

(١) حسن: رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ: ٣٧٦٤، عَنْ وَحْشِيُّ بْنُ حَرْبٍ عَنْ أَبِيهِ عَنْ جَدِهِ (رَضِيَ اللهُ عَنْهُ).

**سوودەکانی ئەم فەرموودە:**

**١- کۆبوونەوەی خێزان لەسەر سفرەی نان خواردن، خۆشەویستیان زیاتر دەکات.**

**٢- هۆکاری زیاد بوونی پیڕۆز بەرەکەتی خوای گەورەیە بۆ ڕزقی ئەم ماڵە.**

**٣- کە ناوی خوا دەهێنی لەسەر نان خواردن، جۆرێکە لە سوپاس گوزاری کردنی خوای پەروەردگار.**

**٤- ئەگەر لە کۆتایی دا، یەك کەس دوعای بەرەکەتی ڕزق و ڕۆزی بخوێنێ، بەر هەمووان دەکەوێ.**



## سوپاس و پێزانین

لە کۆتایی دا زۆر سوپاس بۆ هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی هاوکارم بوون لە پێداچوونەوەو هاوکاری کردن، لە شت زیادو کەم کردنی ئەم کتێبەدا، لە ناخی دڵم دوعای خێریان بۆ دەکەم، خوا بیکاتە توێشووی دوارۆژیان، بە باشترین شێوە پاداشتیان بداتەوە، بە تایبەت بەڕێزان:

(مامۆستا عبدالخالق ڕووناکی، مامۆستا سۆران أحمد، مامۆستا سیروان حامد، خوشکەکانمان: هاوژین أسعد، سارە عبداللە، ئیمان محمد).

سیروان کاکە أحمد

٢٠١٩ /٦/٣٠

هەولێر

# نێوەڕۆك

٥٠

فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ

لەبەرکردنی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە پارێزگاری لێکردن و کار پێکردنی لە کردەوە هەرە باش و گرنگەکانە، وە لە بەڕێزترین و گەورەترینی عیبادەتەکانە، جگە لە فەرزەکان، ئەو کەسەی فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ لەبەر دەکات و لە ماناکەی تێدەگات و لە نێو خەڵك بڵاوی دەکاتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەربارەی فەرموویەتی: «نَضَّرَ اللَّهُ امْرَأً سَمِعَ مِنَّا حَدِيثًا، فَحَفِظَهُ حَتَّى يُبَلِّغَهُ غيره».

لەم فەرموودە دووعا کردن هەیە، یان هەواڵدان هەیە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ دەربارەی حاڵی ئەو کەسەی هەوڵی پاراستن و بڵاو کردنەوەی فەرموودە دەدات.

دیارە تێگەیشتن لە ئایین لە ڕێگەی تێگەیشتن لە قورئان و سوننەتەوە دەبێ، وە تێگەیشتن لە سوننەت لە ڕێی شرۆڤەو شیکردنەوەی زانایان دەبێ، هەر کەس ئەمەی کرد نیشانەی ئەوەیە خوا ویستی خێری بۆی هەیە.


کتێبخانەی
حاجی قادری کۆیی
بۆ چاپ و بڵاو کردنەوە

■ 07504671394 - 07824671394
■ فەیس بووك : کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی
■ هەولێر - بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

DESIGN
07504808081